# خۆشی و ناخۆشیەکانی ناو گۆڕ

## کورتکراوەی پەرتوکی

## ((کتاب أحوال القبور وأحوال أهلها الى النشور))


دانانی

ابو فرج زین الدین عبدالرحمن بن رجب الحنبلی

٧٣٦ - ٧٩٥ هـ

و/ فاروق بالیسانی



یەکەم چاپ

هەولێر 2011

## ناسنامەی کتێب

ناوی کتێب: خۆشی و ناخۆشیەکانی ناو گۆڕ
بابەت : ئایینی
دانانی: أبو فرج زين الدين عبدالرحمن بن رجب الحنبلي
وەرگێرانی: فاروق بالیسانی
کۆمپیوتەر: نوسینگەی هیوا
چاپ : چاپی یەکەم/ ٢٠١١
شوێنی بڵاوکردنەوە: ((کتێبخانەی حاجی قادری کۆیی))

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی سپاردنی ( ٢٧٩٤ )ی ساڵی ( ٢٠١٠ )ی پێدراوە.

بڵاوکراوەی کتێبخانەی
حاجی قادری کۆیی
بۆ فرۆشتن و چاپکردن و بڵاوکردنەوە
هەولێر - کوردستان - عراق
( ٠٧٥٠٤٦٧١٣٩٤ / ☎ - ٠٦٦٢٢٢٣٨٦٨ )

# خۆشی و ناخۆشیەکانی ناو گۆڕ

کورتکراوەی پەرتووکی

﴿کتاب أهوال القبور و أحوال أهلها إلى النشور﴾

دانانی

أبو فرج زين الدين عبدالرحمن بن رجب الحنبلي

٧٣٦ - ٧٩٥ هـ

وەرگێڕانی

فاروق بالیسانی

هەولێر

٢٠١١ز ١٤٣١ ك

## بەناوی خوای گەورە و میهرەبان

## کورتە ژیاننامەیەکی نووسەر

ناوی (عبدالرحمن)ی کوری ئەحمەدی کوڕی عبدالرحمن ئەبو فەرەج زین الدینی ناسراو بە حافظ ئیبن ڕەجەب حەنبەلیە ، فەرمووەدەناس و شەرع زان و خوا پەرستێکی دنیا نەویست بوو .

لەساڵی (٧٣٦)ی کۆچی لەبنەماڵەیەکی بەناوبانگ بەزانست و چاکسازی و زانا و زانست پەروەر ، لە شاری بەغدا لە دایك بووە ، پاشان هێشتا منداڵ بووە لە سالی (٧٤٤) ی کۆچی ، خێزانەکەیان بەرەو دیمەشق ڕۆیشتووە . ئینجا خەریکی فێربوونی فەرمووەدە بووە . دوایی باوکی لەگەڵ خۆی بردویەتی بۆ (مصر) تاوەکو لەلای زانایانی ئەویَ فێرە زانست بێت ، پاشان بۆ هەمان مەبەست چۆتە مەککە بۆ ئەوەی لە زانستی زانایانی ئەویَ بەهرەمەند بێت.

لە پێناو خویندن دا چوەتە خزمەت زانا بەناوبانگەکانی سەردەمی خۆی ، سوودی زانستی زۆری لیَ وەرگرتـوون ، بەشێوەیەك فەرمووەدە و شەرعی خوێندووە تاوەکو بەتەواوی شارەزایی لیَ پەیدا کردوە . هەروەها ئەوهێندە شارەزا بووە لە زانستی فەرمووەدە ، تاوەکو بە ئاسانی لقەکانی ئەم زانستە بزانێت وەکو : زانینی ناوەکان ، و گێڕەرەوەکان و هەموو هۆکارەکانی دیکەی زانستی فەرمودەناسی ، بۆ ئەوەی بەهۆیەوە فەرمودەی ڕاست و دروست(صحيح) لەدانراو (موضوع) جیابکاتەوە و بیناسێتەوە . هەروەوەها بە چاکەکار و دونیا نەویست ناسرابوو، ژیانی خۆی تەرخان کردبوو بۆ زانست ، چ بە فێرکردن بێت یاخود بە دانان و نووسینی پەرتووك بێت ، لەساڵی (٧٩٥)ی کۆچی ، کۆچی دوایی کردوە . زیاتر لە (٧٣) دانراوی لە دوای خۆی بەجیَ هێشتوە . خوای گەورە بەمیهرەبانی خۆی لەگەڵ بکات و بە بەهەشتە پان و بەرینەکەی خۆی شاد بکات .

❊ ❊ ❊

# پێشەكی

پیشەوا و ڕابەر و زانای ناوازە ، ئەبو فەرەج زین الدین عبدالرحمن كوری صالح (المقرئ) شهاب الدین ئەحمەد كوری رەجەب (میهرەبانی خوای گەورەی لێبێت) دەڵێت :

سوپاس و ستایش بۆ ئەو خوایەی بەندەكانی لەم دونیایەدا نیشتەجێ كردوە ، ئەم دنیایەی گێراوە بە خانەی كاركردن و گەشت كردن ، هەروەها ماڵی دوارۆژیشی كردوە بە ماڵی ڕنینەوەی بەرهەم و وەرگرتنی پاداشت و شوێنی پشوودان و جێگیربوونی هەتاهەتایی . بەهەمان شێوە ناوبەند(بەرزەخ)ێكی لە نێوان دونیا و دوارۆژدا دروست كردوە ، كە بەڵگەیە لەسەر نەمانی ئەم دونیایە ، ئنجا هەر كەسێك بمرێت ئەچێتە نێو ژیانی ئەم ناو بەند(بەرزەخ)ە ، و تیایدا دەمێنێتەوە ، تاوەكو كاتی زیندووبوونەوە لە ڕاستیدا ژیانی ناوبەند، یان مێرگێكە لە مێرگەكانی بەهەشت ، یاخود چاڵێكە لە چاڵەكانی دۆزەخ . پاكی و بێگەردی بۆ ئەو خوایەی ئەوەی حەز بكات دروستی دەكات و هەڵی دەبژێرێت، نەرم و نیانی ئەنوێنێت لەگەڵ چاكەكاران ، میهرەبانیەكەی پێش خەشم و توورەیی یەكەی كەوتوە ، هەروەها زۆر بە میهرەبان و خاوەن بەزەیی یە لەگەڵ بڕواداران لە ڕۆژی دوایی دا . بەهەمان شێوە - زۆر لێبوردەشە - لەگەڵ هەموومان لەم ژیانەی ئێستاماندا .

سوپاس و ستایشی دەكەم لەسەر نیعمەتە زۆر و بێ ئەندازەكانی . گەواهی ئەدەم هیچ پەرستراوێك نیە جگە لە الله (ﷻ) نەبێت ، تاك و تەنیاو بێ هاوبەشە ، هەروەها گەواهی ئەدەم (محمد) بەندەو نێردراو و پێغەمبەری هەڵبژێردراوە لەلای ئەو ، تاوەكو مژدەی خۆشیمان بداتێ لەسەر خوا پەرستی و چاكەكردن ، هەروەها ترسێنەر و ورياكەرەوەشە لەسەر بێ فەرمانی خوای گەورە و خراپە كردن (دروودی خوای گەورە لەسەر خۆی و ئالی بەیت و هاوەڵەكانی بێت ، بەدرێژایی ڕۆژ و شەو ) .

لە ڕاستیدا خوای گەورە نەوەی (ئادەم)ی بۆ مانەوە دروست كردوە نەك بۆ لەناوچوون ، بەڵكو "مردن" شێوازێكی گواستنەوەیە، دوای دروست كردنیان لە ماڵێك (شوێنێك)ەوە — كە

نێو دونیایە — بۆ شوێنێکی تر کە ژیانی دوارۆژە دەگوازرێنەوە . ئەوسا دوای ئەوەی دروستیکردن و لەم دونیایەدا نیشتەجێی کردن ، ویستی تاقیانبکاتەوە ، بۆ ئەوەی دەربکەوێت کامەیان کاری جوانتر و باشتر ئەنجام دەدات . دونیا خانەی کارو تاقیکردنەوەیە نەوەك خانەی پشوودان و پاڵکەوتن ، پاشان ئەگواسترێنەوە بۆ ژیانی ناو بەند (بەرزەخ) لەوێ بەند ئەکرێن تاوەکو لە ڕۆژی زیندوبوونەوە هەموویان کۆئەکرێنەوە، ڕۆژی زیندووبونەوە خانەی پاداشت و مانەوەیە ، ئینجا هەموو کەسێکی کارکردوو پاداشتی کارەکەی بەووردی و بەدرێژی وەر ئەگرێتەوە لەگەڵ ئەوەش "ئەوان" لە نێو خانەی ناوبەند (بەرزەخ) دا پاداشتی چاکە ، یاخود سزا و ئازاری خراپەکانیان وەرئەگرن . ئەگەر چاکەیان کردبێت ڕێزیان لێ ئەگیرێت ، خۆ ئەگەر خەراپەیان کرد سەرزەنشت و ئازار دەدرێن . خوای گەورە فەرموویەتی : ﴿... وَمِن وَرَآئِهِم بَرْزَخٌ إِلَىٰ يَوْمِ يُبْعَثُونَ / واتە : ... بەڵکو دەبێت لە جیهانی بەرزەخدا ، لە نێوان مردن و زیندوو بونەوەدا تا کاتێك زیندوو دەکرێنەوە چاوەڕێ بێت ﴾ . ﴿ المؤمنون: ١٠٠ ﴾ [1].

موجاهید لە بارەی ئەم ئایەتە ئەڵێت : ناوبەند (بەرزەخ) : پەردە و ناوبەندێکە لە نێوان مردن و گەڕانەوە بۆ دونیا ، هەروەها دەڵێت : ناوبەند(بەرزەخ) : نێوان مردن و زیندووبونەوەیە .

(حسن ) دەڵێت: ئەو گۆڕەی ئێوەیە لە نێوان ئێوە و لە نێوان دوارۆژدا .

(عطاء) خوراسانیش ئەڵێت : ناوبەند (بەرزەخ) ، ماوەی نێوان دونیا و دوا ڕۆژە . جارێك وتیانە (شەعبی) : فلأنە کەس مرد . (شەعبی)ش وتی : ئەو نە لە ژیانی دونیایە ، و نە لە دوا ڕۆژیشدایە ، ئەو لە ژیانی ناوبەند (بەرزەخ) دایە .

جارێك گوێی لە پیاوێك بوو، وتی : فلأنە کەس مردوە ، بۆیە ئێستا خەڵکی دوارۆژە . ئەویش وتی : مەڵێ لە خەڵکی دوارۆژە ، بەڵکو بڵێ : لە خەڵکی نێو گۆڕە .

---

( ١) ئەو ڕاڤەکردنەو هەمو ڕاڤەکردنەکانی دیکەی ئایەتەکانی قورئانی پیرۆز لە ( تەفسیری ئاسان بۆ تێگەیشتنی قورئان ) لە نوسینی : بورهان محمد امین ، وەرگیراوە .

هەندێك لە برا باشەكانم داوای ئەوەیان لیّ كردم هەواڵی ناوبەند (بەرزەخ) و مردووەكانیان لە پەرتووكێكدا بۆ كۆبكەمەوە ، چونكە لە بیستن و خوێندنەوەی ئەمانە – بەهۆیەوە – دڵ ئامۆژگاری وەر ئەگرێت . مرۆڤی بیّ ئاگا ، ئاگادار ئەكاتەوە . بۆیە منیش داوای یارمەتیم لە خوای گەورە كرد لە كۆكردنەوەی هەواڵی ژیانی مردوان لە قورئان و سوننەت و ڕووداوەكانی پێشینی گەلی موسڵمانان ، هەروەها لەوتەی دانایانیش چ بە شێوەی شیعر یان هی دیكە بێت . ئەمانە بەشێوەیەكی كورت و پوخت باسم لێوە كردوون . چونكە ئەگەر بەدرێژی باس بكرێت تێگەیشتنیان قورسەو مرۆڤ تووشی بێزاری ئەكات .

لە خوای گەورەمان داوایە لەو كەسانەمان بژمێرێت كە بۆ دوای مردن كار ئەكەن ، و خۆیان بۆ ڕۆیشتن لەم دونیایە ئامادە ئەكەن و توێشووی تەواو و بێكەموكوڕی پێش ئەوەی مردن یەخەیان پێبگرێت ئامادە ئەكەن ، لە بیستنی ئامۆژگاریەكان – بە فەزڵ و گەورەیی خوای گەورە - بە ئاگا دێنەوە و سودی لیّ ئەبینن

پەرتووكەكە كردوەتە سیانزە بەش ، داوام لە خوای گەورە ئەوەیە لەو كارانەی بژمێرێت كە تەنها لەبەر خاتری ئەو و بەڕاستی و بیّ هەڵە ئەنجام دراون .

ناوم لێناوە پەرتووكی «خۆشی و ناخۆشیەكانی نێو گۆڕ و بارو دۆخی خەڵكەكەی تا ڕۆژی زیندوو بوونەوە» . هیوادارم تەنها بۆ خوای گەورە بێت و سوود بەخش بێت لە دونیا و دوا ڕۆژ بۆ ئێمە و هەموو ئەوانەی ئەیخوێننەوە یاخود ئەیبیستن . هەر خوای گەورەش بەخشندەترین و میهرەبانترینە .

❊ ❊ ❊

خوای گەورە دەفەرموێت : ﴿ يُثَبِّتُ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ بِٱلْقَوْلِ ٱلثَّابِتِ فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا وَفِى ٱلْءَاخِرَةِ ۖ وَيُضِلُّ ٱللَّهُ ٱلظَّٰلِمِينَ ۚ وَيَفْعَلُ ٱللَّهُ مَا يَشَآءُ \ واتە : خوای گەورە ئەوانەی باوەڕیان هێناوە پایەدار ئەکات لەسەر گوفتاری بەجێ و دروستیان لە ژیانی دونیادا ، لەسەرەمەرگ و قیامەتیشدا ، (باوەڕی دامەزراو فریایان دەکەوێت)و گوفتاریان ڕێك و پێك و دامەزراو دەبێت و بە ئیمانەوە دەمرن ، لەولاشەوە هەر ئەو خوایە ستەمکاران گومڕا دەکات ئەوەی پەروەردگار بیەوێت هەر ئەوە پێش دێت و دەکرێت ﴾ ﴿ إبراهيم:٢٧﴾

لە ﴿صەحیحی بوخاری و موسلیم﴾دا لە فەرموودەی (براء)کوری عازب (ﷺ) ئەویش لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) دەگێڕێتەوە و فەرموویەتی: ئایەتی ﴿ يُثَبِّتُ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ بِٱلْقَوْلِ ٱلثَّابِتِ ... ﴾﴿إبراهيم: ٢٧﴾ . دەربارەی سزای نێو گۆڕ هاتۆتە خوارەوە . {بوخاری گێراویەتیەوە}.

موسلم زیادی کردوە کاتێك مردوو ئەخرێتە نێو گۆڕ : [ ( فریشتە پرسیاری لێ ئەکات و پێی دەڵێن : کێ پەروەردگارتە ؟ ئەڵێت : (الله - ﷻ) پەروەردگارمە ، (محمد) یش پێغەمبەرمە ] ئا ئەمەیە فەرموودەی خوای گەورە : ﴿ يُثَبِّتُ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ بِٱلْقَوْلِ ٱلثَّابِتِ ... ﴾ (إبراهيم: ٢٧ ).

(طبراني) دەریهێناوە لە فەرموودەی (براء)ی کوڕی عازب ، ئەویش لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) دەگێڕێتەوە و دەفەرموێت : «لەنێو گۆڕ پرسیار لە بێباوەر ئەکرێت : پەروردگارت کێیە ؟ ئەویش دەڵێت : نازانم . لەو کاتەدا ، کوێر و لاڵ وکەڕ ئەبێت ، ئینجا بە دارێکی بەهێز لێی ئەدرێت ، ئەگەر بەو شێوەیە لە چیایەك بدرێت ، ئەوا ئەبێتە خاك و خۆڵ ، جگە لە جنۆکە و مرۆڤ ئەبێت ئەگەر نا هەموو شتێك ئەیبیستێت . وتی : ئینجا پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەم ئایەتەی خوێندەوە : ﴿ يُثَبِّتُ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ بِٱلْقَوْلِ ٱلثَّابِتِ ... ﴾ » . ﴿إبراهيم: ٢٧﴾ . {طبراني گێراویەتیەوە} .

ئەبو داود دەریهیناوە ، ئەویش لە پێغەمبەر (ﷺ) ئەگێڕێتەوە و دەفەرموێت : «کاتێك (مردوو) ئەنێو گۆڕدا دادەنێن و ئەڕۆن ، ئەو "واتە مردوەکە" گوێی لە دەنگی پێڵاوەکانی ئێوەیە کاتێك ئەڕۆنەوە ماڵەوە ، لەو کاتەش فریشتەی نێو گۆڕ دێن و پرسیاری لیّ ئەکەن : پەروەردگارت کێیە ؟ ئایینت کامەیە ؟ پێغەمبەرت کێیە ؟» {ئەبو داود گێڕاویتیەوە} .

لە گێڕانەوەیەکی ئەودا هاتوە ، ئەڵێت : «دووفریشتە دێن و دایئەنیشینن و پێی ئەڵێن : پەروەردگارت کێیە ؟ ئەڵێت : پەروەردگارم خوایە . پێی ئەڵێن : ئایینت کامەیە ؟ دەڵێت : ئایینم ئیسلامە ، پێی دەڵێن : ئەی چی ئەڵێی دەربارەی ئەو پیاوەی بۆ لای ئێوە نێردراوە ؟ ئەڵێت : ئەو نێردراو و پێغەمبەری خوایە . پێی دەڵێن : چ کار دانەوەیەکت لە بەرامبەری هەبوو ؟ ئەڵێت : پەرتووکی خوای گەورەم خوێندەوە ، ئینجا باوەڕم پێهێناو بەڕاستم دانا» . {ئەبو داود گێڕاویتیەوە}

لە گێڕانەوەیەکی تردا هاتوە : «ئەمە فەرموودەی خوای گەورەیە کە ئەفەرمووێت : ﴿ يُثَبِّتُ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ بِٱلْقَوْلِ ٱلثَّابِتِ ... ﴾ . ﴿إبراهيم: ٢٧﴾ . ئەڵێت : ئینجا خوای گەورە لە ئاسمانەوە بانگ ئەکات و ئەڵێت : بەندەی من راست ئەکات ، و بەهەشتی بۆ ئامادە بکەن دەرگایەکی بەهەشتیشی بۆ بکەنەوە ، و پۆشاکی بەهەشتیانی پیّ بدەن . ئەڵێت : ئنجا بۆن و بەرامە خۆشەکەی بەهەشتی بۆ دێت . وە بە ئەندازەی بینینی چاوەکانی ، گۆڕەکەی بۆ فراوان ئەکەن» . وتی : باسی بێباوڕی کرد و ، فەرمووی : « گیانەکەی ئەگێڕنەوە بۆ نێو لاشەکەی ، ئەوسا دوو فریشتە دێنە لای ، لە نزیکی دائەنیشن ، پاشان پێی ئەڵێن : پەروەردگارت کێیە ؟ ئەڵێت : ها ها !! نازانم . پێی ئەڵێن : ئایینت کامەیە ؟ ئەڵێت : ها ها !! نازانم . ئنجا لە ئاسمانەوە خوای گەورە بانگ دەکات و دەڵێت : بەندەی من درۆی کرد ، دۆزەخی بۆ ئامادە بکەن ، و پۆشاکی ئاگرینی پیّ بدەن ، و دەرگایەکی دۆزەخی بۆبکەنەوە . دەڵێت : لەو کاتەدا گەرما ، و زووخاو ، و ژەهراوی دۆزەخی بۆدێت . ئەڵێت : ئینجا بە ئەندازەیەك گۆڕی بۆ تەسك ئەکەنەوە تاوەکو پەراسوەکانی تێك ئەشکێنێت» . {ئەبو داود گێڕاویەتیەوە} .

لە گێرانەوەیکی تردا هاتوە : «پاشان فریشتەی سزادانی دێت -کوێر و لالە (لە رووی میهرەبانی نواندنەوە بەرامبەری) و پارچە ئاسنێکی قورسی بەدستەوەیە ، ئەگەر هاتوو لە(چیا)یێك بدات ئەوا ئەیکاتە خاك و خۆڵ» . ئەڵێت : « لێدانێکی بەهێزی لێ ئەدات ، ئەوەی لە نێوان رۆژهەلات ورۆژئاوادایە ، جگە لە جنۆکەو مرۆڤ نەبێت ، ئەگەر نا هەمویان دەنگی ئەم لێدانەی ئەبیستن، ئەوسا دەڵێن ئەبێتە خاك و خۆڵ» . ئەڵێت : «پاشان گیانی ئەگێرنەوە ناو لاشەکەی» . {ئەبو داود گێراویەتیەوە} .

لە گێرانەوەی پێشەوا ئەحمەد هاتوە : «فریشتەیەکی کوێر و لاڵ — لە بێ میهرەبانی دا — پارچەیەکی ئاسنی قورسی بەدەستەوەیە ، ئەگەر پێی لە (چیا) بدات ئەوا ئەبێتە خاك و خۆڵ ، ئنجا لێدانێکی بەهێزی لێ ئەدات ، بەهۆیەوە ئەبێتە خاك و خۆڵ ، دوایی خوای گەورە وەکو خۆی لێ ئەکاتەوە . دوبارە لێدانێکی بەهێزی دیکەی لێ ئەدرێت ، ئەویش — لەتاو ئازار و ئێشی جەستەکەی - هاوارێکی بەهێز ئەکات ، بەشێوەیەکە جگە لە جنۆکە و مرۆڤ نەبێت ، ئەگەر نا هەمو شتێك ئەیبیستێت» . {ئەحمەد گێراویەتیەوە} .

(براء) کوری عازب ئەڵێت : «پاشان دەرگایەکی دۆزەخی بۆ ئەکرێتەوە ، و رایەخێکی ئاگرین ی بۆ رائەخرێت» . {ئەحمەد گێراویتیەوە} .

هەروەها (ئیبن مەندە) لەم رووەوە دەریهێناوە ، زیاتر لە فەرموودەکانی دیکە ، ئەوەیە : «ئەگەر هەمو مرۆڤ و جنۆکە کۆببنەوە لەسەر ئەوەی بەرگەی ئەم ناخۆشیە بگرن ، ئەوا ناتوانن ، ئنجا لێدانێکی بەهێزی لێ ئەدرێت بەهۆیەوە ئەبێتەوە خاك و خۆڵ ، دوایی گیانی بۆ ئەگێرنەوە ، ئەوسا لێدانێکی لە نێویە چاوان ئەدرێت کە هەمو شتێکی سەر زەوی ، جگە لە مرۆڤ و جنۆکە نەبێت، ئەیبیستێت ، داتر بانگ بێژێك بانگ ئەکات — و ئەڵێت - : دوو رایەخی ئاگرینی بۆ رابخەن ، و دەرگایەکی دۆزەخیشی بۆبکەنەوە» . {انظر السنة لعبدالله بن احمد بن حنبل} .

لە (براء)ی کوری عازب ، ئەویش لەپێغەمبەرەوە(ﷺ) ، لە بارەی بڕوادارەوە دەفەرمووێت : «دوو فریشتە — بەناوی — مونکیر ، و نەکیر ، دێنە لای ، ئەوسا دای ئەنیشێنن» . {بەیهەقی گێراویەتیەوە} .

هەمان شتی بۆ بێباوەر باس کرد ، و ئەمەشی زیاد باس کرد : «دەنگیان وەکو هەورەتریشقەیەو، چاوەکانیشیان وەکو تیشکی بروسك بەهێزە» . فەرمووی : «بە پارچە ئاسنێکی بەهێز لێیان ئەدرێت ، ئەگەر هەموو کەسێك کۆببنەوە ، هێشتا بەرگەی ئەو لێدانە ناگرن» . {ئەحمەد گێراویەتیەوە} .

لە ﴿صەحیحی موسلیم و بوخاری﴾ لە فەرمودەی (قەتادە) دا ، هاتوە ، ئەویش لە ئەنەس ئەگێڕێتەوە ، ئەلێت : پێغەمبەری خوا (ﷺ) فـەرموویەتی : «کاتێك مردوو ئەخرێتە نێو گۆڕ ، پاشان کەس و کارەکەی ئەڕۆن ، ئەویش دەنگی پێی نەعلەکانیان ئەبیستێت — کاتێك ئەوان ئەڕۆن ، ئینجا دوو فریشتەی بۆ دێن و لە لای دائەنیشن و ئەلێن : لە ژیانی دونیا دا — لە بارەی ئەم پیاوە "محمد" (ﷺ) هەڵوێستت چۆن بو ؟ ئینجا ئەگەر بڕوادار بێت ئەلێت : گەواهی ئەدەم ئەو (واتە : محمد) بەندەو نێردراوی خوایە ، فریشتەکان پێی ئەلێن : سەیری شوێنی خۆت بکە لە نێو دۆزەخ ، ئەوا خوای گەورە لەجیاتی ئەوە شوێنێکی لە بەهەشت دا بۆ ئامادە کردووی ، ئەوانیش شوێنەکەیانی نیشان ئەدەن» . {بوخاری و موسلیم گێڕاویەتیانەوە} .

(قەتادە) وتی : بۆیان باس کردووین : بەئەندازەی بینینی چاوەکان گۆڕی بۆ فراوان ئەکەن — پاشان گەڕایەوە سەر فەرموودەی ئەنەس — و ، وتی : «بەڵام سەبارەت بە دووڕوو ، و بێباوەڕ ، ئەوا پێی ئەوترێت دەربارەی ئەم پیاوە "واتە : محمد" لە دونیا دا چ کاردانەوەیەکت هەبوو ؟ ئەویش ئەلێت : نازانم ، هەمان وتەی خەڵکم دووبارە ئەکردەوە ، ئەوسا پێی ئەوترێت : ئەتزانی و هەڵەت کردووە ، پاشان بە ئاسنێکی بەهێز لێی ئەدرێت ، ئـەویش لـە تاو ئێش و ئـازاری جـەستەکەی هاوارێك دەکات ، تەنها مرۆڤ و جنۆکە نەبێت ئەگەر نا هەموو شتێك ئەیبیستێت» . {بوخاری گێراویەتیەوە} .

(ئەبو داود) بە هەندێك زیادەوە دەریهێناوە — ئەلێت - : «بە بڕوادار ئەلێن : چیت ئەپەرست ؟ ئینجا ئەگەر خوای گەورە ڕێنموێنی کردبێت ، ئەوا ئەلێت : (الله - ﷻ)م دەپەرست . پاشان پێی ئەوترێت : ئەی دەربارەی ئەم پیاوە - واتە : محمد — هەڵوێستت چۆن بوو؟ ئەویش ئەلێت : بەندە و نێردراوی خوایە ، ووتی : ئنجا هیچ پرسیاری دیکەی لێ ناکرێت» . هەروەها زیاتریش هاتوە : «کە بڕوادارەکەش ، وەك خۆشی دەربڕینێك — دەلێت : لێم گەڕێن بابچم مژدەی

خۆشی بدەمە کەس و کارم . ئینجا فریشتەکانیش پێی ئەڵێن : دانیشە» . وە باسی بێباوەڕیشی کرد : لەوەی کە (چ)شتێکی ئەپەرست ، و هەڵوێستی لەبارەی ئەم پیاوە (واتە : محمد) چۆن بوە . {ئەحمەد و ئەبو داود گێراویەتیانەوە} .

لە ﴿صەحیحی بوخاری و موسلیم﴾دا هاتوە لە فەرموودەی ئەسمائی کچی ئەبوبەکر ، کە پێغەمبەر (ﷺ) لەوتاری ڕۆژگیراندا ، فەرموویەتی : «(سروشتی)م بۆ هاتوە کە ئێوە لەنێو گۆڕەکانتاندا تاقی ئەکرێنەوە وەکو، یان نێزیك لە تاقیکردنەوەی فیتنەی (مەسیح ی دەجال) ، یەکێك لە ئێوە ئەهێنن ، ئنجا پێی ئەووترێت : چ زانیاریەکت دەربارەی ئەم پیاوە هەیە ؟ ئنجا ئەگەر بڕوادار بێت ، ئەوا ئەڵێت : (محمد) نێردراوی خوایە و بە بەڵگەو ڕێنوێنی یەوە بۆ ئێمە هاتووە ، ئێمەش وەلاّمان دایەوە و بڕوامان پیّ هێنا و شوێنی کەوتین ، پاشان پێی ئەوترێت : بخەوە بە باشی ، ئێمە زانیمان کە تۆ باوەڕداری ، بەلاّم دووڕو (منافق) لە وەلاّم دا ئەڵێت : نازانم ، گوێم لە خەڵکی بوو شتێکیان ئەووت ، منیش - بیّ بیرکردنەوە - وەکو ئەوانم ئەوت» . {بوخاری گێراویەتیەوە} .

پێشەوا ئەحمەد دەریهێناوە - کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی : وشەکەشی بەم شێوەیە : «ئێوەم لە نێو گۆڕەکان بینی کە تاقی ئەکرانەوە ، و پرسیار لە پیاو ئەکرا : لەوەی (چ)ت ئەوت ؟ و چیت شتێکت ئەپەرست ؟ ئینجا ئەگەر بڵێت : نازانم ، گوێم لە خەڵکی بو شتێکیان ئەوت ، منیش دووبارەم ئەکردەوە ، شتێکیان ئەکرد منیش لاساییم ئەکردنەوە . فریشتەکانیش پێی ئەڵێن : بەڵیّ ، لەسەر گومان ژیاوی ، هەروەها لەسەر گومانیش مردووی ، ئا ئەمە جێگەتە لە نێو ئاگر . خۆ ئەگەر بڵێت : گەواهی ئەدەم هیچ پەرستراوێك نیە جگە لە (الله ﷻ) نەبێت ، و( محمد) یش نێردراوی خوای گەورەیە ، ئەوا ( فریشتەکانیش ) پێی ئەڵێن : لەسەر دڵنیایی و باوەڕەوە ژیاوی، و هەروەها لەسەر دڵنیایی و باوەڕیش مردووی ، ئا ئەمە جێگەتە لەنێو بەهەشت» . {ئەحمەد گێراویەتیەوە} .

(ترمذي) و (ئیبن حبان ) لە ( صحیح)ەکەیان دا لە فەرموودەی ئەبو هورەیرە دەریان هێناوە ، ئەویش لە پێغەبەرەوە (ﷺ) کە فەرموویەتی : «ئەگەر مردوو - یان وتی : یەکێك لە ئێوە — خرایە نێو گۆڕ دوو فریشتەی ڕەشی ، چاو شینی بۆ دێن ، یەکیان ناوی : مونکەر (منکر)ە

، و ئەوی دیکەشیان ناوی : نەکیر(نکیر)ە ، ئینجا دوو فریشتەکانیش لێی ئەپرسن : دەربارەی ئەم پیاوە (واتە : محمد) ، چیت، ئەوت ؟ ئەوسا ئەگەر بڕوادار بێت — هەمان وتەی دونیای دووبارە ئەکاتەوە ، و ئەڵێت : ئەو (واتە : محمد) بەندە و نێردراوی خوای گەورەیە ، گەواهی ئەدەم هیچ پەرستراوێك نیە جگە لە ( الله _ ﷻ) نەبێت ، (محمد)یش بەندە و نێردراوی ئەوە . ئنجا دوو فریشتەکانیش ئەڵێن : ئێمە دەمانزانی کە تۆ ئەمە ئەڵێیت ، پاشان بەئەندازەی هەفتا باسك (ذراع) گۆڕەکەی بۆ فراوان ئەکرێت ، و بۆی ڕووناك ئەکەنەوە ، پاشان پێی ئەوترێت : بخەوە ، ئەویش ئەڵێت : - ڕێگەم بدەن - با بگەڕێمەوە لای کەس و کارم ، و هەواڵی ئەم خۆشیەیان پێ بدەم ، دوو فریشتەکانیش پێی ئەڵێن : بخەوە وەکو خەوتنی زاوایێك کە تەنها خۆشەویست ترین کەس نەبێت ، ئەگەر نا کەس هەڵی ناستێنێت — بخەوە — هەتاوەکو خوای گەورە لە جێگەکەت خەبەرت ئەکاتەوە . - ئەمە سەبارەت بە باروودۆخی بڕوادار بوو - ، بەڵام ئەگەر (دووڕوو) بێت ، ئەوا لە وەڵامی فریشتەکان ئەڵێت : گوێم لە خەڵکی بوو قسەیەکیان ئەوت منیش هەمان قسەی ئەوانم دووبارە ئەکردەوە ، نازانم ، ئینجا فریشتەکانیش ئەڵێن : ئێمە ئەمانزانی کە ئەمە وەڵامی تۆ ئەبێت ، ئنجا بەزەوی (گۆڕەکەی) ئەڵێن : خۆت بلکێنەوە بەیەکتر (واتە : بیگووشە) ، پاشان لایەکانی زەوی (گۆڕەکەی) بە ئەندازەیەك لەیەکتر نزیك ئەبنەوە تاوەکو پەراسووەکانی تێك ئەشکێنێت ، ئەم سزایەشی تاوەکو ڕۆژی زیندوبونەوە بەردەوام ئەبێت» . {ترمذی گێراویەتیەوە ، ئەمە فەرموودەیەکی «حسن» ە} .

هەروەها پێشەوا ئەحمەد و ئیبن ماجە ، لە فەرموودەی (ئەبو هورەیرە)یان دەرهێناوە ، ئەویش لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) ئەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی : « لەنێو گۆڕ پیاوچاکان دائەنشنرێن، بەبێ ئەوەی ترس و بیمیان لەسەر بێت ، پاشان پێی ئەووترێت : لە دونیا دا چۆن ژیانت گوزەراند ؟ ئەویش ئەڵێت : بەگوێرەی ئیسلام ژیانم بەسەر ئەبرد . دوایی پێی ئەوترێت : هەڵوێستت چۆن بوو دەربارەی ئەم پیاوە (واتە : محمد) ؟ ئەویش دەڵێت : محمد نێردراوی خوای گەورەیە (ﷺ) ، و لەلایەن خواوە ڕوونکەرەوی ڕێگەی ڕاستی ژیانی بۆ هێناوین ، ئێمەش باوەڕمان پێکرد . ئەوسا پێی ئەوترێت : ئایا (خوا)ت بینیوە ؟ ئەویش لە وەڵامدا ئەڵێت : پێویست ناکات (بۆ هیچ کەسێك) خوای گەورە ببینێت ، ئینجا بەشێك لە ئاگری دۆزەخی نیشان ئەدەن ،

ئەویش سەیرێکی ئەکات کە چۆن - لەبەر زۆری گەرمیەکەی - یەکتری ئەخواتەوە، دوای پێی ئەوترێت : تەماشا بکە خوای گەورە لە چی پاراستووی ، پاشان بەشێك لە خۆشی بەهەشتیشی نیشان دەدەن ، ئەویش سەیرێکی ئەکات ، و پێی ئەڵێن : "دوای زیندوبونەوەت" ئەمە شوێنی تۆیە ، هەروەها پێی ئەووترێت : تۆ لەسەر دڵنیایی و باوەڕەوە ژیاوی ، و بەهەمان شێوەش لەسەری مردووی ، بەهەمان جۆریش — بە ئیزنی خوای گەورە - لەسەری زیندوو ئەبیتەوە . هەروەها پیاوی خەراپ و بەدیش لەنێو گۆڕەکەیدا داینەنیشێنن ، کە لەبارو دۆخێکی پڕ ترس و لەرزدایە ، و پێی ئەووترێت : لە دونیا دا چۆن ژیانت بەسەر برد ؟ ئەڵێت : نازانم . پێی ئەڵێن : هەڵوێستت لە بارەی ئەم پیاوە (واتە : محمد) چۆن بوو ؟ ئەویش ئەڵێت : گوێم لە خەڵکی بوو شتێکیان ئەوت ، منیش لاساییم ئەکردنەوە ، ئینجا بەشێك لە خۆشیەکانی بەهەشت و ئەوەی لە ناوی دایە ، پێ نیشان ئەدەن ، و پێی ئەڵێن : تەماشابکە - بەهۆی کردەوە خراپەکانت - خوای گەورە لە(چ) خۆشیەکی بێ بەش کردووی؟ پاشان بەشێك لە ئاگری دۆزەخی پێ نیشان ئەدەن ، ئەویش سەیرێکی ئەکات کە چۆن - لەبەر زۆری گەرمیەکەی - یەکتری ئەخواتەوە ، ئینجا پێی ئەڵێن : ئا ئەمە جێگەی تۆیە لە دوارۆژدا چونکە لەسەر گومان ژیاوی ، هەروەها لەسەر گومانیش مردووی ، بەهەمان شێوەش - بە ئیزنی خوای گەورە - لەسەری زیندوو ئەبیەوە» . {ئیبن ماجە گێراویەتیەوە ، و فەرمودەیەکی «صحیح» ە} .

پێشەوا ئەحمەد لە فەرموودەی جابر دەریهێناوە ، ئەویش لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) کە فەرموویەتی : «ئەم گەلو (ئوممەت)ە ، لەنێو گۆڕەکانیان تاقی ئەکرێنەوە ، ئینجا ئەگەر بڕوادار خرایە نێو گۆڕ ، دواتر هاوڕێ و کەس و کارەکەی لە لای ڕۆیشتن فریشتەیەکی زۆر بە سام هەیبەت ی دێتەلا ، و پێی ئەڵێت : دەربارەی ئەم پیاوە (واتە : محمد) هەڵوێستت چۆن بوو ؟ بڕوادارەکەش ئەڵێت : بەندە و نێردراوی خوای گەورەیە . فریشتەکەش ئەڵێت : سەیری شوێنی خۆت بکە لەنێو ئاگری دۆزەخ ، خوای گەورە لەم ناخۆشیە ڕزگاری کردووی و گۆڕیویەتی بە شوێنێکی دیکە لەنێو بەهەشت، دوایی بڕوادارەکەش هەردوو شوێنەکە ئەبینێت ، بۆیە ئەڵێت : مۆڵەتم بدەن با ئەم مژدە خۆشە بدەم بە کەس و کارەکەم . فریشتەکەش پێی ئەڵێت : دابنیشە . بەڵام سەبارەت بە دووڕو(و بێباوەڕ) لەو کاتەی کە هاوڕێ و کەس و کارەکەی لەلای ئەڕۆن ،

فریشتەکە دێت و دایەنیشێنێت ، پرسیاری لێ ئەکات ، ئەڵێت : هەڵوێستت سەبارەت بە ئەم پیاوە (واتە : محمد) چۆن بوو ؟ ئەویش ئەڵێت : نازانم ، هەمان قسەی خەڵکم دووبارە ئەکردەوە ، و لاساییم ئەکردنەوە . فریشتەکەش پێی ئەڵێت : نەتزانی ! سەیرکە ئەمە شوێنی تۆ بو لە بەهەشت ، لەبەر هەڵوێست و کردەوە خراپەکانت ، خوای گەورە لە جیاتی ئەم شوێنە خۆشەی نێو بەهەشت شوێنێکی دیکەی لەناو ئاگری دۆزەخ بۆ ئامادە کردووی» . {ئەحمەد گێڕاویەتیەوە} .

جابر وتی : گوێم لە پێغەمبەری خوا بوو (ﷺ) ئەیفەرموو : «هەموو بەندەیەك لەسەر ئەو بیر و ڕایەی مردوە ، زیندوو ئەکرێتەوە ، بڕوادار لەسەر بڕوایەکەی ، دووڕووش لەسەر دووڕوویەکەی زیندوو ئەکرێنەوە» . {موسلیم گێڕاویتیەوە} .

(ئیبن ماجە)ش لە فەرموودەی جابری دەرهێناوە ، ئەویش لە پێغەمبەری خوا (ﷺ) کە فەرمویەتی : «ئەگەر مردوو خرایە ناو گۆڕ ، ڕۆژ ئاوانابێت تاوەکو (مردوەکە) دانەنیشێت و دەم و چاوی خۆی پاك نەکاتەوە و ، ئەڵێت : لێم گەڕێن با نوێژەکەم بکەم» . {ئیبن ماجە گێڕاویەتیەوە ، و فەرموودەیەکی - حسن - ە} .

هەروەها پێشەوا ئەحمەد لە فەرموودەی عائیشە دەریهێناوە ، ئەویش لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) کە فەرموویەتی : سەبارەت بە تاقیکردنەوەی نێو گۆڕ ، ئەوا لەبارەی منەوە تاقی ئەکرێنەوە ، لە بارەی منەوە پرسیارتان لێ ئەکرێت ، ئنجا ئەگەر مردوەکە ، کەسێکی چاك و باش بوبێت ، ئەوا بە بێ ئەوەی ترس و لەرزی لەسەر بێت دایەنیشێنن ، پاشان پێی ئەڵێن : ژیانت چۆن بەسەر برد ؟ ئەڵێت : بەگوێرەی ئیسلام بوو. پێی ئەڵێن : ئەم پیاوەی لەناو ئێوەدا بو (واتە : محمد) چی بوو - واتە هەڵوێستت لەبارەیەوە چۆن بوو ؟ ئەویش ئەڵێت : محمد نێردراوی خوایە ، لە لایەن خوای گەورەوە ، ڕێنوێنی و ڕووناکی بۆ ئێمە هێنا ، و ئێمەش باوەڕمان پێهێنا و بەڕاستمان دانا . دواتر بەشێك لە ناخۆشی و ئاگری نێو دۆزەخ ی پێ نیشان ئەدەن ، کە چۆن لەبەر گەرمیە زۆرەکەی یەکتری ئەخواتەوە ، و پێی ئەڵێن : سەیر بکە خوای گەورە لە چ سزاو ناخۆشیەك ڕزگاری کردووی ، پاشان بەشێك لە خۆشیەکانی بەهەشتی پێ نیشان ئەدەن ، ئەویش سەیری خۆشی بەهەشت وئەوەی لەناوی دایە ، ئەکات ، پێی ئەڵێن : ئەمە شوێنی تۆیە لەنێو بەهەشت ، هەروەها پێشی ئەڵێن : لەسەر دڵنیایی و باوەڕەوە ژیاوی ، ومردووی ، هەروەها بەئیزنی خوای



گەورە لەسەر ئەم دڵنیایی و باوەڕەوە زیندوو ئەکرێیەوە . بەڵام ئەگەر مردووەکە کەسێکی خەراپ و بەد بوبێت ، لە باروودۆخێکی پڕ ترس و لەرزدا ، داینەنیشێنن ، ئینجا پرسیاری لێ ئەکەن ، و ئەڵێن : ژیانت چۆن بەسەر برد ؟ ئەویش ئەڵێت : نازانم . پێی ئەڵێن : ئەم پیاوەی (واتە : محمد) لەناو ئێوەدا ئەژیا چۆن بوو ؟ ئەویش ئەڵێت : گوێم لە خەڵکی بو شتێکیان ئەوت، منیش دووبارەم ئەکردەوە ، و لاساییم ئەکردنەوە . ئینجا بەشێك لە خۆشیەکانی بەهەشتی و ئەوەی لە ناوی دایە ، پێی نیشان ئەدەن، و پێی ئەڵێن : سەیر بکە ، خوای گەورە لەبەر کردەوە خەراپەکانت لە (چ) خۆشیەك بێ بەشی کردووی . ئینجا بەشێك لە ئاگری دۆزەخیشی نیشان ئەدەن ، کە چۆن لەبەر گەرمیە زۆرەکەی یەکتری ئەخواتەوە ، و پێی ئەڵێن : ئەمە شوێنی تۆیە لەنێو دۆزەخ . چونکە لەسەر گومان و دوودڵی ژیاویت و مردووی ، هەروەها بە ئیزنی خوای گەورەش لەسەری زیندوو ئەبیتەوە ، پاشان سزا ئەدرێت» . {ئەحمەد گێراویەتیەوە} .

پێشەوا ئەحمەد لە فەرموودەی ئەبو سعیدی خودری دەریهێناوە ، کە ئەڵێت (واتە : ئەبو سەعیدی الخودری ئەڵێت): ئێمە لەگەڵ پێغەمبەری خوادا (ﷺ) خەریکی ناشتنی لاشەی مردوێك بوین ، پێغەمبەر خواش (ﷺ) فەرمووی: «ئەی خەڵکینە ئەم گەلە ، لە گۆڕەکانیان تاقی ئەکرێنەوە، ئەگەر هاتو مرۆڤ مرد ، و کەس و کار و هاوڕێیەکانیش ناشتیان ، و پاشان ڕۆیشتن، فریشتەیەك دێت بۆ لای کە دارێك (یان ئاسنێك)ی بەهێزی بەدەستەوەیەو، داینەنیشێنێت ، پاشان پێی ئەڵێت : لەبارەی ئەم پیاوە (واتە : محمد)ەوە هەڵوێستت چۆن بوو ؟ ئینجا ئەگەر بڕوادار بێت ، ئەوا ئەڵێت : گەواهی ئەدەم هیچ پەرستراوێك نیە جگە لە ( الله _ ﷻ) نەبێت ، (محمد)یش نێردراوی خوایە ، فریشتەکەش ئەڵێت : ڕاست ئەکەیت . پاشان دەرگایەکی ئاگری دۆزەخی بۆ ئەکەنەوە ، و پێی ئەڵێن : ئەمە جێگەی تۆ بوو ئەگەر باوەڕت بە خوای گەورە نەهێنابایە ، کاتێکیش باوەڕت بە خوای گەورە هێنا ، ئا ئەمە شوێنی تۆیە لە دوا ڕۆژدا ، لەو کاتەش دەرگایەکی بەهەشتی بۆ ئەکەنەوە ، بڕوادارەکەش لەخۆشی بەهەشت ئەیەوێت هەڵسێتەوە ، فریشتەکەش پێی ئەڵێت : دانیشە ، ئینجا گۆڕەکەی بۆ فراوان ئەکەن .

ئەگەر هاتوو بێباوەڕ یان (دووڕوو)ش بێت ، فریشتەکە - هەمان پرسیاری بڕوادارەکەی لێ ئەکات - و پێی ئەڵێت : هەڵوێستت لەبارەی ئەم پیاوە: (واتە : محمد) چۆن بوو ؟ ئەویش



ئەلێت : نازانم ، گوێم لە خەلكى بوو شتێكيان ئەووت منيش دووبارەم ئەكردەوە ، و لاسايى ئەوانم ئەكردەوە . فريشتەكەش پێى ئەلێت : نەتزانى ، وبە هەلە داچووى ، ڕێگەت بزر كردوە ، پاشان دەرگايەكى بەهەشتى بۆ ئەكەنەوە ، و پێى ئەلێن : ئەمە شوێنى تۆ بوو ئەگەر باوەڕت بە خواى گەورە هێنابايە بەلاّم لەوكاتەى بێباوەڕ بوويت ، ئەوا خواى گەورە ئەم خۆشيەى لىّ گۆڕى بە ناخۆشى ، و لەوكاتەشدا دەرگايەكى ئاگرى دۆزەخى بۆ ئەكەنەوە پاشانو فريشتەكە بەو دارەى (يان ئاسنەى) كە لە دەستيايەتى ، لێدانێكى بەهێزى لىّ ئەدات ، هەمو بونەوەرێك (جگە لە مرۆڤ و جنۆكە نەبێت) ئەگەرنا دەنگى لێدانەكە ئەبيستێت» . هەندێك لە ئامادەبوانيش وتيان : ئەى پێغەمبەرى خوا (ﷺ) : ئەگەر بە هەر كەسێك بوترێت : ئاگادارى خۆت بە لەو فريشتەيەى نێو گۆڕ ، چونكە دارێك (يان ئاسنێك)ى بەهێزى پێيە - واتە : خۆت بۆ وەلاّمى فريشتەكان ئامادە بكە ، ئەوا زۆر لێى ئەترسێت . پێغەمبەريش(ﷺ) ئەم ئايەتەى خوێندەوە : ﴿ يُثَبِّتُ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ بِٱلْقَوْلِ ٱلثَّابِتِ ... ﴾ ﴿إبراهيم: ٢٧﴾ - لە پێشدا ڕاڤەى ئەم ئايەتە كراوە . {ئەحمەد گێڕاويەتيەوە} .

پێشەوا ئەحمەد ، و ئيبن حبان لە (صحيح)ەكيدا ، دەريان هێناوە ، لە فەرموودەى عبدالله ى كوڕى عەمرى كوڕى عاص ، كە پێغەمبەرى خوا (ﷺ) باسى تاقيكردنەوەى نێو گۆڕى كرد ، (عمر)يش وتى : ئەى پێغەمبەرى خوا (ﷺ) ئايا لەو كاتەدا هۆشمان بۆ ئەگەڕێننەوە ؟ پێغەمبەرى خواش (ﷺ) فەرمووى : «بەلّىّ ، وەكو ئێستا وان» ، عومەريش وتى : دەى خۆلّى بەدەميەوە بێت "واتە : زۆر ئاسانە" . {احمد گێڕاويەتيەوە} .

ئەبو داود ، دەريهێناوە لە فەرموودەى عثمانى كوڕى عفان (ﷺ) كە ئەلێت : كاتێك پێغەمبەرى خوا (ﷺ) لە شاردنەوەى مردوو تەواو ئەبوو ، ماوەيەك ئەوەستا ، ئەيفەرموو : «داواى لێخۆش بوون ، و دامەزراوى بكەن بۆ براكەتان ، چونكە ئێستا فريشتەكان پرسيارى لىّ ئەكەن» . {ئەبو داود گێڕاويەتيەوە ، فەرموودەيەكى - صحيح - ە} .

لە براء ى كوڕى عازب ، ئەويش لە پێغەمبەرى خوا (ﷺ) ، كە باسى پرسيار لێكردنى بڕوادار لە نێو گۆڕەكەيدا ، و توڕەيى فريشتەى پرسيارکەرى كرد ، فەرمووى : «ئەمە كۆتا



تاقیکردنەوەیە کە بەسەر بڕوادار دا دێت ، ئەمەش فەرموودەی خوای گەورەیە ئەفەرمووێت : ﴿ يُثَبِّتُ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ بِٱلْقَوْلِ ٱلثَّابِتِ ... ﴾ . ﴿ إبراهيم: ٢٧﴾ . {پێشەوا ئەحمەد دەریهێناوە} .

"مەسعودی" لەئیبن مەسعود ئەگێڕێتەوە : کاتێك موسڵمان ئەمرێت ، پاشان ئەینێژن ، فریشتەی پرسیارکەر دێت ، و لەنێو گۆڕەکەیدا ، داینەنیشێنێت ، دوایی پرسیاری لێ ئەکات و ، ئەڵێت : پەروەردگارت کێیە ؟ ئاینت کامەیە ؟ پێغەمبەرت کێیە ؟ وتی : پاشان خوای گەورەش دامەزراوی ئەکات ، بۆیە بڕوادارەکەش ئەڵێت : (الله) پەروەردگاری منە، ئاینم ئیسلامە ، (محمد)یش پێغەمبەرمە . ئینجا گۆڕەکەی بۆ فراوان ئەکەن ، ناخۆشیەکەی لەسەر لائەکەوێت ، پاشان عبدالله ئەم ئایەتەی خوێندەوە :﴿ يُثَبِّتُ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ بِٱلْقَوْلِ ٱلثَّابِتِ ... ﴾. ﴿ إبراهيم: ٢٧﴾ . {طبراني گێڕاویەتیەوە} .

* * *

## وچانێك

خوای گەورە ، وەکو ڕێزگرتنێك لە هەندێك لە بەندە خۆشەویستەکانی خۆی ، ئەو فەرمودانەی کە گێڕاومانەتەوە ، بۆ هەندێك کەسی هێناوەتە جێ و ، هەر لە دنیادا شێوەی ئەم پرسیار و وەڵامەیان بیستوە یاخود بینیویانە . ئێمەش هەندێك لەوەی پێمان گەیشتووە باس ئەکەین .

شەبابەی کوڕی سوار ، ئەگێڕێتەوە لە عەبداڵڵای کوڕی عوبەیدی ئەنصاری ، کە وتویەتی : من لەو کەسانە بووم ئامادەی ناشتنی لاشەی سابتی کوڕی قەیس کوڕی شماس بووم ، کە لە ڕۆژی ( یەمامە )دا پێکرابوو، شەهیدبوو بوو ، ئنجا دوای ئەوەی خستمانە نێو گۆڕەکەی ، بیستمان ئەیوت: محمد نێردراوی خوای گەورەیە ، ئەبوبەکری ڕاستگۆ ، عومەری شەهید ، عوسمانی میهرەبان ، لەو کاتەی ئەو قسانەی ئەکرد، ئێمەش بۆ دڵنیا بوون سەیرێکمان کرد، بینیمان مردوە و گیانی تێدانیە .

هەروەها ئیبن ئەبو دونیا دەریهێناوە ئەویش لە ڕێگای یەزید كوڕی طریف ، ئەڵێت : كاتێك براكەم كۆچی دوایی كرد ، ئێمەش ناشتمان ، پاش ئەوەی ئەوەی خەڵكەكەڕۆیشتن ، سەرم لەسەر گۆڕەكەی دانا ، دەنگێكی لاوازم بیست ، ئەمزانی ئەم دەنگە ، دەنگی براكەمە ، و ئەیوت : (الله) ، دەنگێكی دیكەش ئەیوت : ئەی ئایینت كامەیە ؟ ئەویش ئەیوت : ئایینم ، ئیسلامە.

علاء كوڕی عبدالكريم ، ئەڵێت : پیاوێك مرد ، ئەو پیاوەش برایەكی هەبوو كە بینینی چاوەكانی لاواز بوو، برایەكەی وتی : كاتێك براكەم مرد ، ئێمەش ناشتمان ، ئینجا دوای ئەوەی خەڵكەكە گۆڕستانیان بەجێ هێشت ، سەرم لەسەر گۆڕەكەی دانا ، گوێم لە دەنگێك بوو لە نێو گۆڕەكەدا ئەیوت : پەروەردگارت كێیە ؟ پێغەمبەرت كێیە ؟ بیستم براكەم ئەیوت : (الله) پەروەردگارمە ، محمد (ﷺ) پێغەمبەرمە ، ئەویدیكەش ئەیوت : ئایینت كامەیە؟ براكەم ئەیووت : ئایینم ئیسلامە .

لە پەرتووكی «القبور» ، بەجۆرێكی دیكەیە و، ئەڵێت : دەنگێكم لەنێو گۆڕەكەیدا بیست ئەیوت : پەروەردگارت كێیە ؟ پێغەمبەرت كێیە ؟ گوێم لە دەنگی براكەم بوو ، دەنگم بەباش ئەناسی ، ئەیوت : پەروەردگارم (الله) یە ، (محمد)یش پێغەمبەرمە ، پاشان لەناو گۆڕەكەی بە ئەندازەی - نزیكەی - تیرێك بەرز بووەوە بۆ لای گوێچكەكەم ، هەموو پێستم هاتەوە یەك و ڕۆیشتم .

* * * * *

ترمذی دەریهێناوە و ئەگێڕێتەوە لە ئەبو سەعید ، ئەویش ئەڵێت : پێغەمبەری خوا (ﷺ) چوە شوێنی نوێژەکەی ، بینی - وەك ئەوە وایە - خەڵك زۆر پێبکەنێت ، بۆیە وتی : «ئێوە ئەگەر زۆر یادی لەناو بەری خۆشیەکان (واتە : مردن) بکەنەوە ، ئەوا ئەو پێکەنینە زۆرە و لەبیر ئەچوەوە ، بۆیە زۆر بیری لەناوبەری خۆشیەکان (مردن) بکەنەوە ، چونکە هیچ رۆژێك نیە کە گۆڕ(قبر) نەڵێت : من خانوی نامۆیی (غەریبـی)م ، من ماڵی تەنهاییم ، ماڵی کرم و رزینی لاشەم ، ئینجا ئەگەر هاتوو بڕوادارێك لەنێو گۆڕەکەدا نێژرا ، گۆڕەکە پێی ئەڵێت : بەخێر بێیت و خۆش هاتی ! بەڕاستی تۆ خۆشەویست ترین ئەو کەسانەی کە بەسەر پشتم دا رێیان کردوە، و هاتوون بۆلام ، ئینجا ئەگەر هاتوو ئەمرۆ ، رۆیشت و تۆش لەلام مایەوە ئەوا کردەوە ، وکاردانەوەی من ئەبینی بەرامبەر بە تۆ کە چۆن ئەبێت ، پاشان بە ئەندازەی بینینی چاوەکان (گۆڕەکەی) بۆفراوان ئەکات ، و دەرگایەکی بەهەشتی بۆ ئەکاتەوە .

بەڵام ئەگەر هاتوو مرۆڤی بێباوەڕ یان خەراپەکار خرایە نێو گۆڕ ، ئەوا (گۆڕ) پێی ئەڵێت : نە بەخێر بێیت ، و نە خۆش هاتی بەڕاستی تۆ ناحەزترین کەسی کە بەسەر پشتم دا رێت کردبێت و، دوایی هاتبێتە لای من ، ئینجا ئەگەر ئەمرۆ ، رۆیشت و تۆش لەلای من مایەوە ئەوا کارو،کاردانەوەی من ئەبینی بەرامبەر بە تۆ کە چۆن ئەبێت . ووتی : بە ئەندازەیەك گۆڕەکەی لەسەر دێتەوە یەك ، هەتاوەکو ئەگاتە پەراسوەکانی یاخود ئەیان شکێنێت» . لەو کاتەش پێغەمبەری خوا (ﷺ) پەنجەکانی بۆ ناویەکتر برد. و فەرمووی : «حەفتا ماری بەسەردا زاڵ ئەکەن ، ئەگەر هاتوو تەنها یەکێکیان فویەك لەسەر زەوی بکات ئەوا تاوەکو دونیا ماوە هیچ شتێکی لێ سەوز نابێت ، ئەم مارانە بەردەوام ئەزیەت و ئازاری ئەدەن تاوەکو رۆژی هەڵسانەوە - قیامەت - بەردەوام ئەبێت» . وتی : پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی : «گۆڕ یان مێرگێکە لە مێرگەکانی بەهەشت ، یاخود چاڵێکە لە چاڵەکانی دۆزەخ» . وتی ئەم فەرموودەیە (غریب)ە نائاشنایین پێی تەنها لەم ڕووەوە نەبێت {ترمذي گێڕاویەتیەوە، سەنەدەکەشی لاوازە} .

له ئەبو حەجاجى ثمالى يەوە، وتى : پێغەمبەرى خوا (ﷺ) فەرموويەتى : «لەوكاتەى مردوو ئەخرێتە نێو گۆڕ ، گۆڕەكە پێى ئەڵێت : ناخۆشيت بێتە سەر ! كێ بووە هۆى ئەوەى منت لەبير بچێتەوە ! ئايا نەتئەزانى من (واتە : گۆڕ) ماڵى تاقيكردنەوەيە ، ماڵى تاريكييە، ماڵى تەنهايى يە ماڵى كرم و رزينى لاشەكانە ، چ شتێك بووە هۆى ئەوەى منت لەبير بچێتەوە لەكاتێكدا بەردەوام بەلاى مندا تێئەپەڕى» . {طبرانى گێراويەتيەوە} .

ئيبن ئەبو دونياش لە رێگەى داود كوڕى نافذەوە دەريهێناوە و ئەگێرێتەوە ، كە ئەڵێت: لەگەڵ عبدالله كوڕى عوبەيد كوڕى عومەير ئامادەى ناشتنى لاشەيەك بوين ، ئنجا وتى : پێيان ڕاگەياندوم كە پێغەمبەرى خوا (ﷺ) فەرموويەتى : «مردوو كە خرايە نێو گۆڕ دائەنيشێت ، لە بارودۆخێكدايە، دەنگى پێى پێلاوەكانى ئەو كەسانە ئەبيستێت كە ئەويان ناشتووە ، هيچ شتێك پێشى گۆڕەكەى قسەى لەگەڵ ناكات ، پاشان (گۆڕەكەى پێى ئەڵێت) ئەى نەوەى ئادەم ناخۆشيت بەسەر بێت ، ئايا كەس ئاگادارى نەكرديەوە لەوەى ئێرە شوێنێكى ناخۆشە ، تەنگ و تاريكە و سەرەڕاى هەبوونى كرم و ئەزيەت و سزا لەلاى من ؟ ئايا بۆچى خۆت بۆ هاتنى ئەو ڕۆژە ، هەروەها هاتنت بۆلاى من ئامادە نەكردبوو؟» . {تەماشاى پەرتووكى – الزهد – ى ئيبن موبارەك بكە} .

لە رێگەى عبدالرحمن كوڕى ئەبوبەكر مەليكى ، دەڵێ : بابم بۆى باس كردم ، ئەويش وتى : عوبەيد كوڕى عومەير بۆى باس كردم ، ئەڵێت : هەمو كەسێك ، كاتێك ئەمرێت ، ئەوا گۆڕەكەى پێى ئەڵێت : من خانووى تاريكيى ، و تەنهاييم ، ئينجا ئەگەر لەژيانى دونياتدا ملكەچى فەرمانەكانى خواى گەورە بووى ئەوا ئيمرۆ بە ميهرەبان ئەبم لەگەڵت ، بەڵام ئەگەر كەسێكى لەرێ دەرچوو بيت ، ئەوا ئيمرۆ من هۆكارى بەلا و ناخۆشيم بۆ تۆ . بەڕاستى من (واتە : گۆڕ) ئەو ماڵەم هەر كەسێك ملكەچ بوبێت ، و بێتە لاى من ، ئەوا بە دڵخۆشيەوە ئەچێتە دەرەوە، كەسێكيش لەفەرمانەكانى خواى گەورە دەرچوبێت ، و بێتە لاى من ئەوا بە خەمبارى ئەچێتە دەرەوە .

ئیبن و ئەبو دونیا (بە سەنەدەوە) لە عومەری کوڕی ذر ئەگێڕێتەوە ، و ئەڵێت : ئەگەر بڕوادار کۆچی دوایی کرد ، و خرایە نێو گۆڕ ، زەوی بانگ ئەکات : ئایا ئەمە ، ملکەچی فەرمانەکانی خوای گەورە بووە ، یان بێ فەرمانی خوای گەورەی کردوە ؟ عمر ئەڵێت : ئنیجا ئەگەر پیاو چاك بێت ، بانگ کەرێك لەلاین گۆڕەوە بانگ ئەکات : ئەی زەوی ببە  بە مێرگێکی خۆش و میهرەبانی لەگەڵ بنوێنە ، بەڕاستی ئەمە لە بەندە چاکەکانی  خوای گەورەیە ، لەو بەندە چاکەو باشانەیە کە هاتۆتە لای تۆ . عمر ئەڵێت : ئنجا زەویش ئەڵێت : ئێستا شایانی ڕێز گرتنە.  بەسەنەدەوە لەمحمد کوڕی سەماکی (واعظ)ەوە ، ئەڵێت : پێیان ڕاگەیاندووین ، کاتێك پیاو ئەمرێت و ئەخرێتە نێو گۆڕ ، و پاشان سزا ئەدرێت یاخود هەندێك ناخۆشی بەسەردا دێت ، ئەوا هاوسێیە مردوەکانی پێی ئەڵێن : ئەی کۆچ کردو لەدونیا ، لە دوای خۆت برا و هاوسێیەکانت بەجێ هێشتوو،  ئایا بەهۆی ئێمە کە لە دونیادا کۆچمان کرد ، پەند و ئامۆژگاریت وەرنەگرت ئایا کاتێك ئێمە لە پێش تۆ  ئەم دونیایەمان بەجێ هێشت وکۆچمان کرد ، هیچ بیرت لە دوا ڕۆژی خۆت نەکردەوە ؟ ئایا نەتزانی و نەتبینی کە ئێمە کۆچی دواییمان کرد و مردین ، ڕێگەی کارکردنمان لێ گیرا ، و تۆش بە هۆی ئەوەی کە لە ژیان دابویت مۆڵەتی کارکردنت هەبوو، ئایا بۆچی ئەو کردەوە چاکانەی کە برایەکانت (بە هۆی مردن و کۆچکردنی هەمیشەییان لەم دونیایەدا) لە دەستیان چوو ، تۆ ئەنجامت نەدا؟

ئەڵێت : پاشان لەناو گۆڕیش بانگی ئەکەن :  ئەی ڕێ لێ ون بوو ، لووت بەرزی لەخۆ بایی بە خۆشیەکانی دونیا ، ئایا بۆچی بە هۆی مردنی کەس و کار و هاوڕێیەکانت (لە پێش تۆوە ، کە بە هۆی خۆشیەکانی دونیاوە لە ڕێ دەرچووبوون و لوتیان بەرز بوو بوو) پەند و ئامۆژگاریت وەرنەگرت ، کاتێك بینیت ئەوانە مۆڵەتی ژیانیان پێش تۆ تەواو بوو و  مردن پاشان "بۆ هەتا ڕۆژی زیندووبونەوە" خرانە نێو گۆڕ ، تۆش بیرت لە بارو دۆخی خۆت نەکردەوە ! .

* * *

نەسائی و ئیبن حەببان لە (صحیح)ەکەیدا دەریهێناوە ، لەفەرموودەی ئەبوهورەیرە (ﷺ) ، ئەویش لە پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە باسی مردن و دەرچوونی گیانی مرۆڤ ، و لەبارەی گیانی بڕواداردا فەرمووی : «- کاتێك بڕوادارێك ئەمرێت و ئەخرێتە نێو گۆڕ - گیانی بڕوادارەکانی دیکەی لیّ کۆ ئەبنەوە ، کە زیاتر لە ئێوە دڵخۆشن لەو کاتەی یەکێکی ونبووتان دێتەوە ، ئەوسا پرسیاری لیّ ئەکەن : فلأنە کەس چی کرد ، و فلأن چۆن بوو ؟ هەندێکیشیان ئەڵێن : لێی گەڕێن با پشوویێك بدات چونکە لەناو خەم و پەژارەکانی دونیادا بوە . ئنجا ئەگەر بڵێت : ئایا نەهاتۆتە لای ئێوە ؟ ئەوانیش ئەڵێن : بردویانەتە ناو دۆزەخ» . {نەسائی گێڕاویتیەوە} .

ئیبن و ئەبو دونیا (بەسەنەدەوە) لە جەعفەر ، ئەویش لە سەعیدی کوڕی جبیر گێڕاویەتیەوە ، و ئەڵێت : ئەگەر هاتوو کەسێك مرد ، ئەوا مردوەکان پێشوازی لێئەکەن ، هەر وەك چۆن کەس و کار پێشوازی لە کەسێکی نادیدە(غائب)یان ئەکەن .

بە سەنەدەوە لە صالحی کوڕی (المری) وتی : پێیان ڕاگەیاندم کەوا گیانەکان لەکاتی مردن دا بەیەك ئەگەن ، ئینجا گیانی مردوەکان ئەڵێن بە ئەو گیانانەی کە دێنە لایان : شوێنت لە دونیادا چۆن بوو؟ ئایا لەکام لاشەدا بویت ، لە لاشەی چاکەکار بویت ، یاخود خەراپەکاردا بویت ؟ وتی : پاشان (گریان زۆری بۆ هێنا) و چاوەکانی فرمێسکی پێدا هاتە خوارەوە .

بە سەنەدەوە لە (ثابت)ی بەنانی ، ئەویش ووتی : پێیان ڕاگەیاندووم کاتێك کەسێك ئەمرێت ، گیانی ئەو خزم و نزیکانەی لەوکاتەدا "پێشتر" مردون پێشوازیەکی گەرمی لیّ ئەکەن . وتی : زیاتر لە ئێوە دڵخۆشن بە هاتنی ئەو تازە مردووە، و هەروەها زیاتر لەوانەش دڵخۆشترن کەوا کەسێکیان لە گەشتێکی دوور بێت ، و ئینجا بگەڕێتەوە لایان .

لە ڕێگەی سوفیان ، ئەویش لە ڕێگەی عەمر کوڕی دینار ، ئەویش لە عوبەید کوڕی عومەیرەوە ، کە ئەڵێت : خەڵکی نێو گۆڕەکان چاوەڕوانی هەواڵی کەس وکارە زیندوەکانیان ئەکەن، ئینجا ئەگەر مردوێکیان بێتە لای ، ئەوا پێی ئەڵێن : فڵانە کەس چی کرد ؟ تازە مردوەکەش ئەڵێت : چاکەکار بوو . هەروەها پێی ئەڵێن : ئەی فلأنە کەس چۆن بوو ؟ ئەویش

ئەڵێت : ئایا نەهاتۆتە لای ئێوە ؟ ئایا بە ئێوە نەگەیشتووە ؟ ئەوانیش ئەڵێن : نەخێر ، پاشان ئەڵێن : ئێمە موڵکی خوای گەورەین ، هەر بۆلای ئەویش ئەگەڕێینەوە ، ئەو ، بەڕاستی ڕێگایەکی بەدەر لەئێمەی هەڵبژاردوە . هەروەها لە (ثابت)ەوە ئەگێڕنەوە کە ئەڵێت : بێ ئومێدم لە پێگەیشتنی ئەو کەسە نزیکانەی من کاتێك ئەوان ئەمرن و هۆگر ئەبن بە دیدەنی من و ، لە کاتی مردنیشم دا من گۆڕاوم .

سرری کوڕی ئیسماعیل ، ئەڵێت : گوێم لە شەعبــی بو باسی کچە مردوەکەی ئەکرد ، و ئەیوت : خوای گەورە (ﷻ) بە میهرەبانی خۆی لەگەڵ بکات ، بەڕاستی بەیەك گەیشتنەوەی ئێمە لەگەڵ مردوەکان نزیکە ، پاشان باسێکی بارودۆخی مردوەکانی بۆ ئێمە کرد ، وتی : کاتێك کەسی مردوو ئەخرێتە نێو گۆڕ ، کەس وکارەکەی ومنداڵەکانی (ئەوانەی مردوون) دێنە لای ، و پرسیاری بارودۆخی خزمە زیندوەکانی لێ ئەکەن ، ئەڵێن : فلان چۆنە و چی کردوە ؟ هەروەها فلانە کەس چۆنە ؟

هەروەها ئادەم کوڕی ئییاس لە (تەفسیرەکەی)دا ئەڵێت : موبارەکی کوڕی (فضالة) بۆی باس کردین ، کە حەسەن ئەڵێت : پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەفەرموێت : «کاتێك بەندەی بڕوادار ئەمرێت ، گیانەکەی ئەڕواتە لای گیانی بڕواداران ، ئەوانیش پێی ئەڵێن : فلان چی کرد ؟ ئەی فلانە کەس چۆن بوو ؟ ئینجا ئەگەر بڵێت : لەپێش من کۆچی دوایی کردوە و مردوە ، ئەوە ئەوانیش ئەڵێن : بردویانەتە دۆزەخ ، ئای کە شوێنێکی چەند ناخۆش و پڕ لە ئازارە» . {حاکم گێڕاویتیەوە ، سەنەدەکەشی دروست "صحيح" ە} .

ئیبن ئەبو دونیا دەریهێناوە لە ڕێگەی یونس ، ئەویش لە حەسەن ، کە ئەڵێت : کاتێك بڕوادار لە سەرەمەرگ دایە ، پێنج سەد فریشتە ئامادەی (گیان) کێشانەکەی ئەبن ، پاشان گیانی ئەکێشن ، و بەرزی ئەکەنەوە بۆ ئاسمانی دونیا ، و لەوێش گیانی بڕوادارە (مردوە) پێشینەکانی پێ ئەگەن ، بۆ ئەوەی هەواڵی کەس و کارە زیندوەکانیانی لێ وەربگرن ، پاشان فریشتەکانیش ئەڵێن : نەرم و نیانی لەگەڵ بنوێنن ، چونکە (تازە) لە ناخۆشییەکی گەورە ڕزگاری بووە . بەجۆرە پیاو پرسیار لەبارەی برا و هاوڕێیەکانی (و کەسو کارەکەی) ئەکات ، تازە هاتوەکەش

"واته : مردووەكەش" بارودۆخەكەى ئەوانەى زيندوون چۆنە ئاوەها بۆيان باس ئەكات . كاتێكيش پرسيار لەبارەى ئەو كەسە ئەكەن كە لە پێش ئەمەوە مردوە . ئەويش لە وەڵام دا ئەڵێـت : ئايا نەهاتۆتە لاى ئێوە ؟ ئەوانيش ئەڵێن : بۆ ، ئايا مردووە ؟ ئەويش ئەڵێت : بەڵێ ، سوێند بەخوا . ئەوانيش ئەڵێن : ئێمە موڵكى خواى گەورەين ، هەر بۆ لاى ئەويش ئەگەڕێينەوە . هەروەها ئەڵێن : بردويانەتە ناو ئاگرى دۆزەخ ، ئاى كە شوێنێكى چەند ناخۆش و پڕ لەئازارە ! .

* * *

ئەبو هورەیرە (ﷺ) ئەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خوا (ﷺ) کە فەرموویەتی : «سوێند بە کەسەی گیانی منی بەدەستە ، مردوو گوێی لە دەنگی پێلاوەکانی ئێوەیە کاتێك ئەگەڕێنەوە ماڵەکانتان . پاشان ئەگەر مردووەکە کەسێکی بڕوادار بێت ، ئەوە نوێژەکانی لە لای سەریەتی و زەکاتەکانیش لە لای چەپەیەتی، هەروەها چاکە کردن لەگەڵ خەڵکیش لە لای پێیەکانی وەستاوە .

پاشان فریشتەکان لە لای سەریەوە بۆی دێن ، نوێژەکان پێی ئەڵێن : ناتوانن لێرەوە بچیت بۆ لای . ئنجا ئەچنە لای ڕاستی ، زەکاتیش ئەڵێت : ناتوانن لێرەوە بچیتە لای . پاشان ئەچنە لای چەپی ، ڕۆژووش ئەڵێت : ناتوانن لێرەوە بچنە لای . پاشان لەلای پێیەکانی ئەچنە لای ، کردەوە چاکەکان ، و چاکە کردن لەگەڵ خەڵکیش ئەڵێت : ناتوانیت لە لای من بچنە لای . ئینجا پێی ئەڵێن : دانیشە ، ئەویش دائەنیشێت ، کە هێشتا ڕۆژیش ئاوا نەبووە، ئینجا فریشتەکانیش پێی ئەڵێن : هەڵوێستت چۆنە دەربارەی ئەو پیاوەی "واتە : پێغەمبەر" (ﷺ) کە بۆ ئێوە ناردرا بوو ؟ ئەویش ئەڵێت : گەواهی ئەدەم ئەو نێردراوی خوای گەورەیە ، بە بەڵگەی ڕوون و ئاشکرا لە لایەن خوای گەورەوە بۆ لای ئێمە هات ، بۆیە ئێمەش بە ڕاستمان دانا و، شوێن فەرمانەکانیشی کەوتین . ئینجا فریشتەکانیش ئەڵێن : ڕاست دەکەی، لەسەر ئەمە ژیاویت و لەسەر ئەمەش مردووی ، بە یارمەتی خوای گەورەش هەر لەسەر ئەمە زیندوو ئەبیتەوە . پاشان بە ئەندازەی بینینی چاوەکان گۆڕەکەی بۆ فراوان ئەکرێت . ئەمەش ، ئەو فەرموودەی خوای گەورەیە کە دەفەرموێت : ﴿ يُثَبِّتُ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ بِٱلْقَوْلِ ٱلثَّابِتِ ... ﴾ ﴿إبراهيم: ٢٧﴾ .

پاشان پێی ئەڵێن : دەرگایەکی ئاگری دۆزەخی بۆ بکەنەوە، ئەوسا دەرگەیەکی دۆزەخی بۆ ئەکەنەوە ، پاشان پێی ئەڵێن : ئەمە شوێنی تۆ ئەدەبوو ئەگەر بێ فەرمانی خوای گەورەت بکردبایە ، بۆیە ئەویش زیاتر دڵخۆش ئەبێت . دوایی پێی ئەڵێن : دەرگایەکی بەهەشتی بۆ بکەنەوە ، پاشان دەرگایەکی بەهەشتیشی بۆ ئەکەنەوە، پێی ئەڵێن : ئەمە ئەو شوێنەیە خوای گەورە پەیمانی پێداویت ، بە هۆی ئەم سەیر کردنەی شوێنی خۆی لە نێو بەهەشت دا، و وەبیرهێنانەوەی پەیمانی

خوای گەورەش (لەوەی شوێنێکی بێ ئەندازە خۆشی لە بەهەشت دا بۆ ئامادە کردوە) زیاتر دڵخۆش ئەبێت . ئینجا لاشەی ئەگەڕێتەوە سەر ئەو شتانەی کە لێی دروست بوە و ئەبێتەوە خاك و خۆڵ ، هەروەها گیانەکەشی ئەچێتە نێو باڵندەیەکی جوانی ناو بەهەشتی (دڵگیردا) .

بەڵام سەبارەت بە گیانی بێباوەڕ ، فریشتەکان کاتێك لەلای سەر بۆی دێن ، هیچ شتێکی لێ نیە کە ڕێگریان لێ بکات ، بەهەمان شێوە کاتێك لە لای پێیەکان بۆی دێن هیچ شتێکی لێ نیە تاوەکو ڕێیان لێ بگرێت . ئینجا بە ترس و لەرزێکی زۆرەوە داینەنیشێنن ، پاشان فریشتەکانیش پرسیاری لێ ئەکەن : (چی) ئەڵێیت دەربارەی ئەم پیاوەی لە ناو ئێوەدا بوو ، (چی) گەواهی یەکی بۆ ئەدەیت ؟ ئەویش ناوەکەی بیر نایەتەوە ، ئینجا پێی ئەڵێن : محمد نێردراوی خوای گەورە (ﷺ) ، ئەویش لە وەڵام دا ئەڵێت : گوێم لە خەڵکی بوو شتێکیان ئەوت ، منیش وەکو ئەوانم ئەوتەوە . پێی ئەڵێن : ڕاست دەکەی ، لەسەر ئەمە (واتە : لەسەر ئەم گومان و لاسایی کردنەوەوە) ژیاویت، بە هەمان شێوە لەسەریشی مردوویت ، هەروەها بە ئیزنی خوای گەورەش لەسەری زیندوو ئەبیتەوە . ئینجا گۆڕەکەی لەسەر تەسك ئەکەنەوە تاوەکو پەراسوەکانی تێك ئەشکێنێت ، ئەمە ئەو فەرمودەی خوای گەورەیە کە ئەفەرموێت : ﴿ وَمَنْ أَعْرَضَ عَن ذِكْرِي فَإِنَّ لَهُۥ مَعِيشَةً ضَنكًا ... \ واتە : ئەوەیش ڕوو وەربگێڕێت لە بەرنامە و یادی من و پشتی تێ بکات ، بێگومان بۆ ئەو جۆرە کەسانە ژیانێکی ترش و تاڵ و ناخۆش دێتە پێش ﴾ ﴿طه: ١٢٤﴾ . پێی ئەڵێن : دەرگایەکی بەهەشتی بۆ بکەنەوە ، ئینجا دەرگایەکی بەهەشتی بۆ ئەکەنەوە و پێی ئەڵێن : ئەمە ئەو شوێنەی تۆ بوو کە خوای گەورە بۆی ئامادە کردبوویت ، ئەگەر هاتوو ملکەچی فەرمانەکانی خوای گەورە بووبایت، بەهۆی ئەمەش خەم و پەژارەکەی زۆرتر ئەبێت ، پاشان ئەڵێن : دەرگایەکی دۆزەخی بۆ بکەنەوە، ئەوسا دەرگایەکی دۆزەخیشی بۆ ئەکەنەوە و پێی ئەڵێن : ئەمە ئەو شوێنەی تۆیە کە خوای گەورە بۆی ئامادە کردوێت ، بۆیە زیاتر خەم وپەژارە داینەگرێت» . {ئیبن حەببان گێڕاویەتیەوە و بەڕاست و دروستی داناوە، ئەمە فەرمودەیەکی "حسن"ە} .

ئیبن مەندە دەریهێناوەو، ئەگێڕێتەوە لە ئەبو هورەیرە ، و ئەڵێت : «کاتێك بڕوادار ئەخرێتە نێو گۆڕەکەی ، شەیتان لە لای سەری دێتە لای ، بەڵام کڕنوش بردنەکان ئەبنە ڕێگر لە نێوان ئەو و شەیتان دا ، پاشان لە لای دەستەکانی بۆی ئەچێت ، خێرو چاکەکانی ئەبنە ڕیگر لێی ، دوایی لە لای سکیەوە بۆی ئەچێت ، ڕۆژووەکانی ئەبنە ڕێگر بۆی ، پاشان لە لای پێیەکانی بۆی دێت ، بەڵام نوێژەکان ئەبنە ڕێگر لێی ، ئینجا یەکێك لە دەرگاکانی بەهەشتی بۆ ئەکرێتەوە ، و ئەویش ئەڵێت : پەروەردگارە بمگەیەنە شوێنەکەم ، ئینجا پێی ئەڵێن : تۆ چەند خوشك وبرایەکت هەن هێشتا نەهاتوون ، جارێ بخەوە بەخۆشی، و لە داهاتوودا هیچ ترس و ناخۆشیەکت لەسەر نیە» .

هەروەها لە ڕێگای محمد کوڕی (الصلت)ەوە ئەگێڕێتەوە ، ئەویش لە کوڕی عەیینە ، ئەویش لە طلحە کوڕی (مُصَرِّف) ، ئەویش لە حازم ، ئەویش لە ئەبو هورەیرە وە ئەگێڕێتەوە ، (فەرموودەکەش مەرفوعە) ، ئەڵێت : «لە نێو گۆڕەوە لە لای سەری بۆ پیاو دێن ، ئینجا ئەگەر هاتن ئەوا خوێندەوەی قورئان ڕێگری ئەکات لەوەی بۆی بێن ، پاشان ئەگەر لە لای دەستەکانی بۆی هاتن ئەوا خێر و چاکەکردنەکانی ڕێگری ئەکەن ، وە ئەگەر هاتوو لە لای پێیەکانی بۆی هاتن ئەوە هاتوو چۆکردنی بۆ مزگەوت ڕێگری لێ ئەکات» . {طبراني لە پەرتووکی - الأوسط - دا گێڕاویتیەوە} ، وەکو ئەمە باسی کردوە ، هەروەك لەم گێڕانەوەیەی ڕابردوودا ، باسی ئەو کەسە کرا کە شەیتان لە نێو گۆڕەکەی (چۆن) دێتە لای .

لە فەرموودەی ئەعمەش ، ئەویش لە (منهال)، ئەویش لە (زازان) ەوە ئەگێڕێتەوە، و ئەڵێت : وتم بە (براء) : ئایا ئەمە فریشتە بوو یاخود شەیتان، وتی : ئەویش زۆر زۆر توڕە بوو ، پاشان وتی : ئێمە زۆر ڕێزمان لە پێغەمبەر (ﷺ) دەگرت ، لەوەی پرسیاری لێ بکەین ئایا ئەوە فریشتە بووە یان شەیتان ، بەڵکو ئێمە تەنها ئەو فەرموودانە بۆ ئێوە باس ئەکەین کە بیستومانە .

پێشەوا ئەحمەد لە فەرموودەی محمد کوڕی (مکندر)ەوە دەریهێناوە ، کە ئەڵێت : ئەسما• باسی فەرموودەی پێغەبەری (ﷺ) ئەکرد ، و وتی : «ئەگەر مرۆڤ خرایە نێو گۆڕەکەی ، ئینجا

ئەگەر هاتوو بڕوادار بێت ئەوا کردەوەکانی (نوێژ و ڕۆژوو) بەرگری لێ ئەکەن ، پاشان وتی : ئینجا فریشتەکە لە لای ئاڕاستەی نوێژەوە بۆی دێت بەڵام نوێژەکە ڕێی لێ ئەگرێت ، هەروەها لە لای ڕۆژووەوە بۆی ئەچێت ، بەهەمان شێوە ڕۆژووش ڕێگەی نادات ، پاشان بانگی ئەکات دابنیشێت ، ئەویش دائەنیشێت ، فریشتەکەش پێی ئەڵێت : دەربارەی ئەم پیاوە "واتە پێغەمبەر" (ﷺ) چی ئەڵێیت بڕوادارەکەش ئەڵێت : کێ ؟ فریشتەکەش ئەڵێت : محمد (ﷺ) ئەویش ئەڵێت : گەواهی ئەدەم کە ئەو نێردراوی خوایە (ﷺ) . وتی : پێی ئەڵێن : ئەوەی کە پێی گەیشتبویت کێ بوو ؟ وتی : ئەویش ئەڵێت : ئەو پێغەمبەری خوایە (ﷺ) وتی : ئینجا پێی ئەڵێن : لەسەر ئەم بڕوایە ژیاویت و مردووی ، بەهەمان شێوە لەسەریشی زیندوو ئەبیتەوە .

وتی : بەڵام ئەگەر مردووەکە تاوان بار بێت ، یان بێباوەڕ بێت ، ئەوا فریشتەکە بۆی دێت بەڵام هیچ شتێك نیە قەدەغەی بکات لەوەی بچێتە لای مردووەکە ، ئینجا دایئەنیشێنێت و پێی ئەڵێت : چی ئەڵێیت دەربارەی ئەم پیاوە ؟ ئەویش ئەڵێت : کامە پیاو ؟ فریشتەکەش ئەڵێت : محمد . ئەویش ئەڵێت : سوێند بەخوا نازانم ، گوێم لە خەڵکی بوو شتێکیان ئەوت، منیش وەکو ئەوان دووبارەم ئەکردەوە . وتی : ئینجا فریشتەکەش پێی ئەڵێ : لەسەر ئەم (گومانە) ژیاویت ، و مردووی ، بەهەمان شێوە لەسەریشی زیندوو ئەبیتەوە . وتی : پاشان بونەوەرێکی بەسەردا زاڵ ئەکەن ، کاتێك ئەم بونەوەرە دێتە لای قامچیەکی بەهێزی پێیە ، ئەوەندەی خوای گەورە حەز بکات ، لێی ئەدات ، (سەرەڕای ئەم لێدانەی) بونەوەرەکەش کەڕە و هیچ نابیستێت و هیچ گوێی لە دەنگی هاوارکردنەکەی نابێت ، ئەوەك میهرەبانی لەگەڵ بنوێنێت» . {احمد گێڕاویەتیەوە ، وسەنەدەکەی دروست – صحیح – ە} .

لە فەرمودەی زاذانیش ، ئەویش لە (برا*)ی کوڕی عازب ، ئەویش لە پێغەمبەری خوا (ﷺ) ، کە لەپێش ئەمەدا باس کرا ، لەبارەی بڕوادارەوە ئەڵێت : «لەناو گۆڕدا پیاوێکی ڕێك و پێکی ڕوو گەشاوە ، کە پۆشاکێکی جوانی پۆشیوە ، و بۆنێکی خۆشی لێدێت ، بە تازە مردوە بڕوادارەکە ئەڵێت : ئایا مژدەت پێبدەم بەو هەواڵەی دڵت خۆش بکات ، بەڕاستی ئەمڕۆ ئەو ڕۆژە (خۆشە)یە کە پەیمانت پێدرا بوو . بڕوادارەکەش پێی ئەڵێت : ئایا تۆ کێیت ؟ ئەویش ئەڵێت

: من کردەوە چاکەکانی (تۆ)م ، بڕوادارەکەش ئەڵێت : پەروەردگارە زوو ڕۆژی زیندووبونەوە بێنە پێش تاوەکو بچمەوە لای کەس وکار ، و ماڵەکەم» . {احمد گێڕاویەتیەوە} .

لەبارەی بێباوەڕیش ئەڵێت : «پیاوێکی ناشیرینی ، پۆشاک نارێك ، و بۆن ناخۆش دێتە لای و پێی ئەڵێت : ئایا مژدەی هەواڵێکت بدەمێ کە بە هۆیەوە پەژارە و غەم دات ئەگرێت ، بەڕاستی ئەمە ئەو ڕۆژە (ناخۆشە)یە کە پەیمانت پێدرابوو؟ ئەویش ئەڵێت : ئایا تۆ کێیت ؟ دەم و چاوەکەت (ڕووە ترش وتاڵەکەت) لە هی کەسێکی بەدکار ئەچێت . پیاوە هاتووەکەش ئەڵێت : من کردەوە خەراپەکانی (تۆ)م . ئەویش (لە ترس و پەژارەی هاتنی ناخۆشیەکانی داهاتوو) ئەڵێت : پەروەردگارا ڕۆژی زیندووبونەوە مەهێنە پێشەوە» . پێشەوا ئەحمەد و جگە لەویش ئەم فەرموودەیان دەرهێناوە . {هەروەها ئەبو داود گێڕاویەتیەوە ، و فەرموودەیەکی دروست — صحیح —ە} .

ئیبن ئەبو دونیا لە عائشەوە (ڕەزای خوای لێبێت) ئەگێڕێتەوە ، کە ئەڵێت : کاتێك تەرمی بڕوادار ئەبەنە دەرەوە ، بڕوادارە مردووەکە بانگ ئەکات و ئەڵێت : سوێندتان ئەدەم بە خوای گەورە خێرا بکەن ، دوای ئەوەی خرایە نێو گۆڕەکەی کردەوەکانی دایئەپۆشن ، نوێژەکان دێن و ئەچنە لای ڕاستیەوە ، ڕۆژووەکانیش دێن و ئەچنە لای چەپیەوە ، کردەوە چاکەکانیشی دێن و ئەچنە لای پێیەکان . ئینجا نوێژ ئەڵێت : ناتوانن لەلای منەوە بۆی بچن ، چونکە نوێژەکانی بەتەواوی ئەنجامداوە . ڕۆژووش ئەڵێت : ئەو ڕۆژووی ئەگرت و گەرووی وشك دەبوو ، بۆیە لە لای من هیچ ڕێگەیەکتان نیە بۆی بچن . ئینجا لە لای پێیەکانەوە بۆی ئەچن ، کردەوە چاکەکانی بە دەنگ دێن و ڕێگر دەبن لەوەی بچنە لای .

لە (ثابت)ی بونانیەوە ، بە سەندەوە ، ئەڵێت : کاتێك مردوو ئەخرێتە نێو گۆڕەکەی کردەوە چاکەکانی ئەبنە پارێزەر بۆی ، لەو کاتەش فریشتەی سزادان دێتە لای ، هەندێك لە کردەوەکانی ئەڵێن : دوورکەرەوە لێی ، خۆ ئەگەر هیچ کردەوەی دیکەی نەبوایە جگە لە من، هێشتا ڕێگات نەدەبوو بچیە لای .

هەروەها ثابت ئەگێڕێتەوەو، ئەڵێت : لەو كاتەی بەندەی چاكەكار ئەخرێتە نێو گۆڕەكەی ، ڕایەخێكی بەهەشتی بۆ ڕائەخەن و، پێی ئەڵێن : پشوو بدە و بە خۆشی بخەوە ، بەڕاستی خوای گەورە لە تۆ ڕازی بوە . وتیشي : بە ئەندازەی بینینی چاوەكان گۆڕەكەی بۆ فراوان ئەكرێت و دەرگایەكی بەهەشتیشی بۆ ئەكرێتەوە ، تەماشای جوانیەكانی ناوی ئەكات و بۆنەخۆشەكەشی ، بۆن ئەكات . لەهەمان كاتیشدا ئیشە چاكەكانی وەكو : ڕۆژوو نوێژ و چاكەكردن ، ئەبنە قەڵغان بۆی و پێی ئەڵێن : ئێمە (تۆ)مان لە دنیادا ماندوو كردوەو تێنووومان كردووی و شەونخونیمان پێوە كردووی ، بۆیە ئەمڕۆ ئێمە هی تۆیین ، بەشێوەیەك كە دڵت پێی خۆش ئەبێت ،"لە نێو گۆڕەكەتدا" ئارامییت پێ ئەبەخشین ، هەتا ئەو كاتەی خوای گەورە بە شوێنەكەت لە بەهەشت دا شادت ئەكات .

بە سەنەدەوە لە كەعب ئەگێڕێتەوە ، و ئەڵێت : كاتێك بەندەی چاكەكار ئەخرێتە نێو گۆڕەكەی كردەوە چاكەكاني : وەكو نوێژ و ڕۆژوو و حەج و تێكۆشان (جهاد) و خێركردن ، چواردەوری ئەدەن . ئەڵێت : ئینجا فریشتەی سزادان لە لای پێیەكانی دێتە لای ، نوێژەكان ئەڵێن : دوور كەرەوە لێی ، لەبەر خاتری خوا زۆر بە پێوە ، وەستاوە . وتی : پاشان لە لای سەری بۆی دێن ، ڕۆژووەكانیش ئەڵێن : هیچ ڕێگەتان نیە بۆی بچن ، چونكە لە دونیادا لەبەر خوای گەورە ، گەروی خۆی زۆر وشك كردوە ، ئازاری تێنوێتی و برسیەتی زۆری چەشتوە . وتی : ئینجا لە لای لاشەكەیەوە بۆی ئەچن ، حەج و تێكۆشانیش ئەڵێن : دووركەونەوە لێی ، چونكە خۆی تەرخان كردبوو ، ماندو بوو بوو ، حەجی كردوە ، و تێكۆشاوە لە پێناو خوای گەورە ، بۆیە ناتوانن بچنە لای . ووتی : پاشان لە لای دەستەكانی بۆی ئەچن ، (خێركردن)یش ئەڵێت : لە هاوڕێیەكەم گەڕێن ، چونكە تاوەكو لە ژیاندا مابوو لە ڕێگەی ئەم دەستانەوە خێرێكی زۆری لە پێناو خوای گەورە ئەنجام داوە ، بۆیە هیچ ڕێیەكتان نیە بچنە لای هاوڕێیەكەم . وتی : ئینجا پێی ئەڵێن : پیرۆزە بە باشی ژیاویت ، و مردووی . وتی : پاشان فریشتەی میهرەبانی دێنە لای و ڕایەخێكی بەهەشتی بۆ ئامادە ئەكەن و بە ئەندازەی بینینی چاوەكان گۆڕەكەی بۆ فراوان ئەكەن و

(ڕوناکی)ەکیشی لە بەهەشتەوە بۆ دێنن بە هۆیەوە تاوەکو ئەو ڕۆژەی خوای گەورە لە گۆڕەکەی زیندووی ئەکاتەوە ، گۆڕەکەی بۆ ڕووناك ئەبێت .

بە سەنەدەوە لە یەزیدی (الرقاشی) ، ئەگێڕێتەوە و ئەڵێت : پێیان ڕاگەیاندووم کاتێك مردوو ئەخرێتە نێو گۆڕەکەی ، کردەوە چاکەکانی دەورەی ئەدەن ، پاشان خوای گەورە بە دەنگیان ئەهێنێت و ئەڵێن : ئەی ئەو بەندەی تەنها لەنێو گۆڕی، ئێستا لە هەموو کەس و کارت جیابویتەوە ، ئیمڕۆ هیچ هاودەم و (هۆگر)ێکت نیە تاوەکو ئارامیت پیێ ببەخشێت جگە لە ئێمە نەبێت . وتی پاشان ئەگرێت و ئەڵێت : خۆشی بۆ ئەو کەسەی چاکەکاران هاودەمیەتی و ناخۆشی و چەرمەسەریش بۆ ئەو کەسەی خەراپەکاران هاودەمیەتی .

دیسان بە سەنەدەوە لە یەزیدی (الرقاشی)ەوە ، لە قسەکانی دا ئەیوت : ئەی بە تەنها کەوتوو لە نێو گۆڕەکەت ، لە نێو سکی زەوی دا هاونشین لەگەڵ کردەوەکانت ، خۆزگەم بە خۆم ، بە (چ) کردەوەیەك مژدەت پێدراوە ، و بە هۆی (چ) برایەك – هاوڕێیەك – یش کە خۆزگەت پیێ ئەخوازن . وتی : پاشان ئەوەندە گریا تاوەکو عەمامەکەی "ملی" تەڕبوو . هەروەها ئەیوت : سوێند بە خوای گەورە بە هۆی کردەوە چاکەکانت مژدەت پێدراوە ، لەبەر برایە باشەکانی یارمەتی دەرت لەسەر پەرستشەکانی خوای گەورە ، خۆزگەت پیێ ئەخوازن .

بە سەنەدەوە لە وەلیدی کوڕی عەمری کوڕی ساج ، کە ئەڵێت : پێیان ڕاگەیاندووم کاتێك مردوو یەکەمین شت لە چوار دەورەی خۆی ، لە لای پێیەکانی ئەبینێت . پێی ئەڵێت : تۆ (چ)یت ؟ شتەکەش ئەڵێت : من کردەوەکانی (تۆ)م .

هاتوە ولە بابەت تکاکردنی قورئانی پیرۆز بۆ خوێنەرەکەی (لە ڕۆژی دواییدا) و ڕێگرتنی لە سزادانی نێو گۆڕ ، بە تایبەت خوێندنی سورەتی (الملك) . نەسائی لە پەرتووکی «کردەوەی شەو و ڕۆژ » دا دەریهێناوە بە سەنەدەوە لەمەسعود کە ئەڵێت : هەرکەسێك سورەتی (الملك) لەهەموو شەوێکدا بخوێنێت خوای گەورە ڕزگاری ئەکات لە سزای نێو گۆڕ . ئێمەش لەو سەردەمەی پێغەمبەر (ﷺ) لە ژیان دابوو، ناوی ئەم سورەتەمان نابوو بە "قەدەغەکار" لە سزای نێو گۆڕ .



عبدی کوڕی حمید لە «مسند»ەکەی لە ئیبن عباس ئەگێڕێتەوە ، کە ئەڵێت : سورەتی (الملك) بخوێنە ، و دەرخی بکە ، کەس و کار ، و منداڵەکانت ، و هاوسێیەکانت فێربکە چونکە ئەم سورەتە ڕزگار کەر و ووتوێژکار و تکاکارە بۆ خاوەنەکەی ، لەبەر ئەوەی لە ڕۆژی زیندوبوونەوەدا لە خزمەت خوای گەورەوە تکا بۆ خوێنەرەکەی ئەکات و داوا ئەکات لەنێو ئاگر ئازادی بکەن ئەگەر لە ناو دۆزەخ دا بوو، بەهۆیەوە خوێنەرەکەی لە سزای ئاگر ڕزگاری ئەبێت .

هیشام کوڕی عەممار ئەگێڕێتەوە و ئەڵێت : عبداللە کوڕی عبدالرحمن کوڕی یزید کوڕی جابر بۆی باس کردین ، ئەویش لە باوکیەوە ئەگێڕێتەوە ، ئەویش لە عطاء کوڕی یەسارەوە ئەگێڕێتەوە، و ئەڵێت : کاتێك مردوو خرایە نێو گۆڕەکەی ، یەکەمین شتێك دێتە لای کردەوەکانیەتی، ئینجا لە ئەژنۆی چەپی ئەدات و پێی ئەڵێت : من کردەوەکانی تۆم . ئەویش ئەڵێت : کوا کەس و کار و منداڵ و هۆزەکەم و ئەو دەسەڵاتەش کە خوای گەورە پێی دابوم ؟ ئەویش ئەڵێت : کەس و کارو منداڵ و هۆز و دەسەڵاتەکەت بەجێیان هێشتی و لەگەڵت نەهاتن نێو گۆڕەکەت ، جگە لە من نەبێت (واتە : کردەوەکانت) ئەگەرنا هەموویان بەجێیمان . مردووەکەش ئەڵێت : خۆزگە "تۆ"م بە باشتر دانابایە لە منداڵ و خزم و ماڵ و سامان ، چونکە جگە لە تۆ (واتە : لە کردەوەکان) کەسی دیکە لەگەڵم نەهاتۆتە نێو گۆڕەکەم .

ئەحمدی کوڕی باوکی (الحواري) ئەڵێت : یەحیای کوڕی سلیم بۆ ئێمەی گێڕایەوە ، ئەویش لە کوڕی ئەبی نەجیح ، ئەویش لە مجاهد ئەگێڕێتەوە لە بارەی فەرمودەو خوای گەورە کە ئەفەرموێت : ﴿ فَلِأَنفُسِهِمْ يَمْهَدُونَ ﴾ واتە : ئەوە ڕێگە بۆخۆیان خۆش دەکەن - بەرەو بەهەشت ﴿الروم: ٤٤﴾ . ئەڵێت : ئەمە لە بارەی گۆڕەوەیە .

ئەحمەد وتی: ئەم فەرمودەیەم بۆ یەحیای کوڕی موعین گێڕایەوە ، ئەویش وتی : بۆ ئەو کەسەی کردەوەی چاکەی هەیە ، چونکە خۆشیەکەی لەنێو گۆڕدا دەست پێ ئەکات .

بەڵگەش بۆ ئەمە بەگشتی، ئەو فەرموودەیە کە لە ﴿صەحیحی بوخاری و موسلیم﴾دا هاتوە ، ئەنەس کوڕی مالك ئەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خوا (ﷺ) کە ئەفەرموێت : «سێ شت

شوێن مردوو ئەکەون ، دوانیان ئەگەڕێنەوە و یەکێکیشیان لەگەڵی ئەچێت . کەس وکار و ماڵ و دارایيەکەی و کردەوەکانی لەگەڵي ئەڕۆن ، ئینجا کەس وکار ، و ماڵ و دارایيەکەی ئەگەڕێنەوە . کردەوەکانیشي لەگەڵي "واتە لە نێو گۆڕدا" ئەمێننەوە» . {بوخاری و موسلیم گێڕاویەتیانەوە} .

هەروەها بەزار و (طبراني) و حاکم بەشێوەیەکی درێژتر لەفەرموودەی ئەنەس گێڕاویتیانەوە لە پێغەمبەر (ﷺ) کە ئەفەرموێت : «هەمو مرۆڤێك سێ هاودەم و هاونشینی هەیە ، یەکێکیان پێی ئەڵێت : ئەوەی بەخشیتەوە هی تۆیە ، ئەوەش کە هەڵت گرتوە هی تۆ نیە ، ئەمەیان ماڵ و دارایيەکەیەتی . هاودەمێکی دیکەشی ئەڵێت : من لەگەڵ تۆ دام ، ئینجا کە گەیشتە گۆڕەکەی نزیك بە فریشتەکان، ئەگەڕێتەوە ، ئەمەیان کەس و کارەکەیەتی . بەڵام هاودەمەکەی تر ئەڵێت : بۆ هەر کوێیەك بچیت و بێیتە دەرەوە من لەگەڵت ئەبم ، ئەمەشیان کار و کردەوەکانیەتی ، بەندەکەش ئەڵێت : تۆ لە هەموویان بۆ من باشتری» {حاکم گێڕاویەتیەوە} .

ئیبراهیم کوڕی بەشار ئەگێڕێتەوە ، لە ئیبراهیم کوڕی ئەدهەم ئەویش ئەو شیعرەی ئەوت:

« هیچ کەسێك بەڕێزتر نیە لەو کەسەی
لە نێو گۆڕدا کردەوەکان هاودەم و هاونشینیەتی
لاشەیەکی پاك و بێگەرد
لەنێو باغێکدا
خوای گەورە بۆی ڕازاندویەتیەوە
ئەمەش شوێنەکەیەتی»

بەڵام خواناسان و خۆشەویستانی خوای گەورەو پشت لە دونیا هەڵکردوان و هۆگران بە بەرنامە و شەرعی خوا ، ئەوا خوای گەورە بە گەورەیی و بە میهرەبانی خۆیەوە لەنێو گۆڕەکەیان دا ئازاریان نادات ، بەڵکو ئاگای لێیان ئەبێت و تەنهاییەکەی نێو گۆڕیان لەبیر ئەباتەوە ، چونکە ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ مَعَ ٱلَّذِينَ ٱتَّقَواْ وَّٱلَّذِينَ هُم مُّحۡسِنُونَ ﴾ واتە : چونکە بەڕاستی خوا لەگەڵ ئەو

کەسانەدایە کە خۆیان پاراستووە لە گوناھ و ھەروەھا ئەوانەش کە چاکەکار وچاکەخوازن ﴾ ﴿ النحل: ١٢٨﴾ .

لە ھەندێك لەوشەکانی فەرموودەی (یوم المزید) دا ھاتووە، کە بەندەکان لەو ڕۆژەدا بە خوای گەورە ئەڵێن : ئەی خوایە تۆ بوویت لە کاتی نێو گۆڕماندا تەنھاییت لەبیر بردینەوە.

محمدی کوڕی یوسف ئەصفەھانی (عابد) بۆ براکەی نووسی: من ئاگادارت ئەکەمەوە لەوەی نزیکە لە ماڵی کاتیت (دونیا) بەرەو ماڵی ھەمیشەیی و ماڵی پاداشتی کردەوەکانت بڕۆیت ، ئنیجا لەو کاتەش ئەچیتە نێو سکی زەوی دوای ئەوەی لەسەر پشتەکەی بوویت پاشان دوو فریشتە (نکیر، و منکر) دێن و داتئەنیشێنن و پرسیارت لێ ئەکەن ، ئینجا ئەگەر لەو کاتەش خوای گەورە لەگەڵت بێت ھیچ ناخۆشیت بەسەر نایەت ، بەڵام ئەگەر لەگەڵت نەبوو ، ئەوە خوایە بم پارێزیت لە ناخۆشی و تەسکی شوێنەکەت .

ئیبن ئەبی عاصم دوای ئەوەی کە مرد لە خەو بینرا ، و پرسیاری بارودۆخی نێو گۆڕی لێ کرا ، ئەویش وتی : خوای گەورە ھاودەم و ھاونشینمە .

ئەحمەدی کوڕی ئەبو (الحواری) وتی : ئیبراھیم کوڕی فضل لە ئەبو (المليح الرقی) گێڕاویەتیەوە ، کە ئەڵێت : لەو کاتەی مرۆڤ ئەمرێت و ئەخرێتە نێو گۆڕ ، لە دونیادا لە ھەر شتێك ترسابێت ، جگە لە خوا ، ئەوە ئەو شتەی لێی ترساوە لەنێو گۆڕەکەدا دووبارە بۆی دێتەوە و ئەیترسێنێت ، چونکە لە ژیانی دونیادا لێی ترساوە .

عبدالرحمن کوڕی زید کوڕی ئەسلەم ئەگێڕێتەوە لە باوکی ، ئەویش لە کوڕی عومەر(ﷺ) ، ئەویش لە پێغەمبەری خوا (ﷺ) کە ئەفەرموێت : «ترس و بیم لەسەر بڕواداران نیە ، نە لەنێو گۆڕ ، نە لە ڕۆژی دوایی دا. لەو ڕۆژەشدا ( واتە ڕۆژی زیندوبونەوەدا) لە کاتی زیندوبونەوەیان دا تۆز و خۆڵ لەسەر سەریان دائەوەشێنن ، و ئەڵێن : ﴿ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ ٱلَّذِىٓ أَذْهَبَ عَنَّا ٱلْحَزَنَ إِنَّ رَبَّنَا لَغَفُورٌ شَكُورٌ \ واتە : سوپاس و ستایش بۆ ئەو خوایەی کە ھەر چی غەم

ویەژارەیە لە فلّ و دەروونی دەرکردین ، بەڕاستی پەروەردگارمان زۆر لێ خۆشبوو و سوپاسگوزارە ﴿فاطر: ٣٤﴾ . {طبراني لە پەرتووکی الأوسط گێڕاویەتیەوە ، فەرموودەیەکی لاوازیشە} .

## وچانێك

موسلم لە«صحیح»ەکەیدا دەریهێناوە، لەفەرموودەی ئەبو هورەیرە، ئەویش لە پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەگێڕێتەوە ، کە ئەفەرموێت: «کاتێك مرۆڤ ئەمرێت کردەوەکانی کۆتاییان پێ دێت ، تەنها سێ جۆریان نەبێت ، ئەویش : زانستی بەسوود ، یان خێر و چاکەیەکی نەبڕاوە ، یان ڕۆڵەیکی چاکەخواز کە دوعای باشی بۆ بکات» . {مسلم گێڕاویەتیەوە} .

لە فەرموودەی ئەبو هورەیرە وە ، لە پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەگێڕێتەوە ، کە ئەفەرموێت : «هیچ کات داوای مردن مەکەن ، تەنانەت ئەگەر ناخۆشیەکی زۆریشتان بەسەردا هاتبێت ، چونکە هەر کاتێك کەسێك ئەمرێت یەکسەر کردەوەکانی کۆتاییان پێ دێت ، سەرەڕای ئەوەی زۆربوونی تەمەنی بڕوادار خۆشیە بۆی» . {بوخاری و مسلم گێڕاویەتیانەوە} .

ئەبو نەعیم لە پەرتوکی (الحلیە)دا ئەگێڕێتەوە، لە ڕێگەی عەمر کوڕی واقد ، ئەویش لە یونس کوڕی حەلبەس ئەگێڕێتەوە و ئەڵێت : جارێك لە کاتی نوێژی هەینی دا بە گۆڕستانێکی دیمەشقدا ئەڕۆیشت ، لەو کاتەش گوێی لە دەنگێك بوو ئەیوت : ئەمە یونسی کوڕی حەلبەسە وازی لە دنیا هێناوە . سەیرکەن زیندوەکان حەج ئەکەن و هەموو مانگێکیش عەمرە بەجێ ئەهێنن ، لە هەر ڕۆژێکیش دا پێنج نوێژ بەجێ ئەهێنن ، ئێوە کار ئەکەن بەڵام نازانن ، بەڵام ئێمە "واتە : ئەوانەی مردوون" ئەزانین بەس ناتوانین کار بکاین (واتە : لەبەر ئەوەی مردون هەموو شتێك ئەزانن بەڵام ناتوانن هیچ کارێك ئەنجام بدەن) . وتی : لەو کاتەش یونس ئاوڕێکی دایەوە و سڵاوێکی لێ کردن ، ئەوانیش سەلامەکەیان وەڵام نەدایەوە ، بۆیە وتی : سبحان الله وتەکانی ئێوە ئەبیستم ، سڵاوتان لێ ئەکەم ، وەڵامم نادەنەوە ، ئەوانیش وتیان : وتەی تۆمان

یست ، بەلاّم چونكە وەلاّم دانەوە لە ئەنجام دانی چاكەكردن هەژمار ئەكرێت وە لە نێوان ئێمەو چاكە كردن و خراپەكردن دا پەردەیەك هەیە بۆیە ناتوانین وەلاّمت بدەینەوە .

بە سەنەدەوە ئیبن ئەبو دونیا ئەگێڕێتەوە لە سلیمان تەیمی ، ئەویش لە باوكی عثمان ی (النهدی) ئەگێڕێتەوە : كە پیاوێكیان بەرەو گۆڕستان برد و دوای ئەوەی لەنێو گۆڕەكەیان دا ناشتیان ، وتی : منیش دوو ڕكعات نوێژم بەجێ گەیاند ، پاشان لەسەر گۆڕەكە پالّم دایەوە ، گوێم لێبوو باوكی عثمان ئەیوت : سوێند بەخوا بە ئاگا بووم ، كاتێك لەنێو گۆڕەكەدا گوێم لە دەنگێك بوو ئەیووت : ئاگات لە من بێت ئازارم مەدە ، چونكە كەسانێكن ئیش ئەكەن بەلاّم نازانن وە ئێمەش كەسانێكین ئەزانین بەلاّم ناتوانین هیچ كارێك بكەین ، لەبەر ئەوە دوو ركعاتەكەی تۆ بەلای من لەوە و لەوە زۆر خۆشەویستتر و پڕ بایەخترە .

بەسەنەدەوە لە ئەبو (قلابە) ئەگێڕێتەوە و ئەڵێت : لە شامەوە بەرەو بەصرە ڕۆیشتم ، شەو لەنێو چاڵێكدا مامەوە ، لەوێ دەست نوێژم هەڵگرت ، لەشەودا دوو ركعات نوێژم ئەنجام دا ، پاشان سەرم لەسەر گۆڕێك دا ، دانا ئینجا خەوتم ، دوایی بە ئاگا هاتم ، لەو كاتەش دا خاوەن گۆڕەكە (لەنێو گۆڕدا) گلەیی لێ ئەكردم ، و ئەیوت : بە درێژایی شەو منت ئازار داوە ، پاشان وتی : ئێوە نازانن بۆیە كەم كار ئەكەن ، هەروەها ئێمەش ئەزانین بەلاّم ناتوانین كردەوەی چاكە بكەین چونكە مردوین ، بەڕاستی ئەو دوو ركعات نوێژەی ئەم شەو ئەنجامت دا لە هەموو دونیا و ئەوەش لەناوی دا هەیە باشترە ، پاشان وتی: خوا پاداشتی خەڵكی دونیا بداتەوە بە چاكە ، سەلامی ئێمەیان پێ بگەیەنە ، چونكە بەهۆی دوعا كردنی ئەوان ڕووناكی و نوور بە ئەندازەی چیایـێك دێتە نێو گۆڕەكانمان .

بەسەنەدەوە لە حەسەن ئەگێڕێتەوە ، كە ئەڵێت : من و "صفوان" چوینە گۆڕستانێك ، پاشان لەوێ سەری خۆی پێچا ، دوایی بەردەوام یادی خوای گەورەی دەكرد تاوەكو لە گۆڕستانەكە چوینە دەرەوە ، منیش لە بارەی ئەمەوە پرسیارم لێكرد ، وتی : یادی ئەوانم دەكرد ، ئەوانەی كە ئەم یادكردنەی خوای گەورەیان لێ قەدەغەكراوە، ئێمەش لە مۆڵەت داین ، بۆیە ویستم هەندێك

كردەوەیان پێشكەش بكەم ، "حسن"یش وتی : سوێند بە خوا زۆرم پێ خۆشە كە لە هەموو خێر و چاكەیەك دا بەشی هەبێت .

بە سەنەدەوە لە (فضل)ی رەقاشی ئەگێڕێتەوە لە باسكردنی كەسە مردوەكان دا ئەیوت : نای لەو كەسانەی كە لە نێو ئەوان و كڕنووش بردن بۆ خوای گەورەدا ڕێگرێك یاخود پەردەیەك دانراوە ، خۆ ئەگەر پاداشتی كردەوەكان بزانن و دڵسۆزیش بن لەمەدا ، ئەوا خێرا ئەكەن بۆ ئەنجامدانی . پاشان گریاو وتی : براكانم ، چونكە لەنێوان ئێوە و ئاوات و حەزەكانتان دا "ژیانی خۆتان" بۆتە پەردە لەنێوانتاندا ، دەی كەوابو خێراكەن لەوەی كاری چاكە بكەن نەوەك مردن و بەسەر دابێت و نەتوانن هیچ كارێكی دیكە بكەن ، لەبەر ئەوەی نازانن لە چ شەو و ڕۆژێك دا ئەمرن .

بەسەنەدەوە لە صفوان كوڕی سولەیم ئەگێڕێتەوە ، جارێكیان لەگەڵ كۆمەڵێك كەسدا ئامادە بوو لە ناشتنی تەرمی كەسێكدا , ئینجا پاش ئەوەی نوێژیان لەسەر كرد ، صفوان وتی : سەبارەت بە بارودۆخی ئەم مردوە ، ئێستا لە ئەنجام دانی كردەوەكان دابڕاوە ، پێویستی بە نزاو پاڕانەوەی كەسانی دوای خۆیەتی ، بۆیە خەڵكەكەش هەموویان گریان .

ئەبو وهب محمدی كوڕی مزاحم وتی : لە كاتی ناشتنی تەرمی مردوێك پیاوێك چوە لای كوڕی موبارك ، و لەبارەی شتێكەوە پرسیارێكی لێكرد ئەویش لە وەڵامدا وتی : ئەی فلان یادی خوا بكە ، چونكە خاوەنی ئەم جێگەیە (مەبەست لە مردوەكەیە) بەهۆی مردنەكەیەوە ڕێگەی لێ گیراوە .

عەمری كوڕی عەتەبە عادەتی وەهابوو بەشەو سەردانی گۆڕستانی ئەكرد ، و ئەیوت : ئەی خەڵكی گۆڕستان لاپەڕەكان هەڵگیراون و كردەوەكان بەرز كراونەتەوە ، پاشان تاوەكو بەیانی نوێژی ئەكرد ، ئنجا ئەگەڕایەوە نێو ماڵ و منداڵەكانی .

ئەگێڕنەوە جارێكیان هەندێك لە پیاوچاكان مردویان لە خەو بینی ، ئنجا مردوەكان پێیان ئەڵێن : لە بێئاگایی نەبێت هیچی دیكەتان لەلا نیە ، لەخەم و پەژارەش نەبێت هیچمان لەلا نیە .

ئيبن ئەبو دنيا بە سەنەدەوە ئەگێڕێتەوە لەيزيدی كوڕی نعامە كە ئەڵێت : لەكاتی بڵاوبونەوەی نەخۆشی تاعون كچێك بەهۆی ئەم نەخۆشيە لەناوبەرەوە كۆچی دوايی كرد ، دوای مردنی كچەكە ، باببشی لە خەودا كچەكەی بينی ، ئينجا پێی وت : كچەكەم لەبارەی دوارۆژ قسەم بۆبكە ، ئەويش وتی : ئەی باوكە تووشی كارێكی زۆر گەورە بوين ، چونكە ئێمە ئەزانين بەڵام ناتوانين كاربكەين ، و ئێوەش كارئەكەن بەڵام نازانن و بێ ئاگان ، سوێند بەخوا وتنی (سبحان الله)يێك ياخود دووجار ، يان ئەنجام دانی ركعاتێك يان دوو ركعات نوێژ لەبابەت كاكردنەوە بەلامەوە لە هەمور دونيا و ئەوەش لەنێوی دايە خۆشەويست ترە .

جارێكيان هەندێك لە پياوچاكانی پێشين بەلای گۆڕستانێك دا تێدەپەڕين (يەكێكيان) وتی : ئێستا ئەوانە خۆيان پاراستوە لەو شتەی ئێمە بەدوايدا وێڵين .

جارێكيان داودی (طائی) لەگەڵ خەڵك چوە گۆڕستان، و وتی : بزانن خەڵكی دونيا هەموويان خەڵكی گۆڕستانن و ئەمرن ، دڵخۆشن بەو شتەی بۆيان دێتە پێش و بۆيان جێبەجێ ئەبێت ، پەشيمانن لەو شتەی لێی دوا ئەكەون ، ئنيجا ئەگەر ئەو شتەی كە خەڵكی گۆڕستان لەسەری پەشيمانن ، خەڵكی دونيا لەسەری پەشيمان بن ، ئەوە يەكتری لەسەر ئەكوژن و بەربەرەكانێی لەسەر ئەكەن لە دادگاش (بەهۆی ئەمەوە) داوا لەسەر يەكتری تۆمار ئەكەن .

## وچانێك

هەندێك لە خەڵكی بەرزەخ ، خوای گەورە ڕێزيان لێ ئەنێت بەهۆی هێشتنەوەيان لەسەركردەوە چاكەكانيان لەنێو بەرزەخدا ، با هەرچەند پاداشتيشی لەسەر وەرنەگرن لەبەر دابڕانيان لە كاركردندا بەهۆی مردنيان ، بەڵام ئەمە بۆيە لەسەر كردەوەكان ئەمێننەوە تاوەكو خۆشی ببينن بە هۆی يادكردنی خوای گەورە و شوێن كەوتنی فەرمانەكانی (خوا)دا ، هەروەك فريشتە و خەڵكی بەهەشتيش لەنێو بەهەشتدا بەهۆی ئەمەوە خۆشی ئەبينن ، با هەرچەند پاداشتيشی لەسەر وەرنەگرن ، تەنها ئەوە هەيە هەر خودی يادكردنی خوای گەورە و پەرستشی



خوای گەورە ، گەورەترین خۆشیە لەلای خەڵکی بەهەشتیان و لە هەموو خۆشیەکانی خەڵکی دونیا گەورەترە ، هەر بۆیە خەڵکی بەهەشت خەریکی یادکردنی خوای گەورە و پەرستنی ئەو ئەبن.

ترمذی دەریهێناوە لە فەرموودەی ئیبن عباس کە ئەفەرمووێت : هەندێك لە هاوەڵانی پێغەمبەر (ﷺ) شوێنی خۆشاردنەوەیان لە سەر گۆڕێك لێ ئەدا، بەڵام نەیانئەزانی ئەم شوێنە گۆڕی لێیە ، کاتێك زەویان چاڵکرد ، بینیان مرۆڤێك لەناوی دانیشتووە و سورەتی (الملك) ئەخوێنێنت ، بۆیە هاوەڵەکەش هاتە لای پێغەمبەر(ﷺ) و وتی : ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) شوێنی خۆشاردنەوەی خۆمم لێئەدا، بەڵام نەمئەزانی ئەمە گۆڕی تێدایە ، کاتێکیش زەویەکەم چاڵکرد بینیم مرۆڤێك تیایدا دانیشتوە ، سورتی (الملك) هەتاوەکو کۆتاییەکەی ئەخوێنێنت ، پێغەمبەری خواش (ﷺ) فەرمووی : «ئەم سورەتە رێگرە لە ئەزیەت و ئازار ، هەروەها رزگار کەریشە لە سزای نێو گۆڕ» . {ترمذی گێراویتیەوە و ئەڵێت : فەرموودەیەکی حسن ە} .

(هبة الله الطبري اللالكائي الحافظ) لە پەرتووکی (شرح السنة) بەسەنەدەوە لە یەحیای کوڕی موعین ئەگێڕێتەوە و ئەڵێت : گۆڕ هەڵکەنێك پێی وتم سەیرترین شتێك لە کاتی هەڵکەندنی گۆڕدا دیتبێتم ، جارێکیان لە نێو گۆڕێکدا گوێم لە دەنگێك بو وەك دەنگی ناڵە و نرکەی نەخۆش وابوو ، هەروەها لە نێو گۆڕەکەشدا گوێم لە دەنگی بانگدەر بوو کە وەڵامی بانگەکەی ئەدایەوە .

حافظ أبوبكر الخطيب بە سەنەدەوە لە عیسای کوڕی محمد طوماری ئەگێڕێتەوە و ئەڵێت : ئەبوبکر کوڕی مجاهدی قورئان خوێن (المقرئ)م لە خەو دا بینیوە ، وەك ئەوە وابوو قورئانی ئەخوێند ، منیش پێم وت : تۆ مردووی لە هەمان کاتیش دا قورئانیش ئەخوێنیت ؟ ئەویش وتی : لە ژیانمدا لە دوای هەمو نوێژێك و دوای هەمو قورئان تەواوکردنێك لە خویندنەوەی دا (واتە : ختم کردنێك) لەبەر خوای گەورە ئەپاڕامەوە و نزام ئەکرد ، لەو کەسانەم بژمێرێت کە لەنێو گۆڕەکەیان قورئان ئەخوێنن .

* * *

## بەشی پێنجەم

# باسی نیشاندانی بەهەشت و دۆزەخ بۆ خەڵکی نێو گۆڕ لە هەموو بەیانی و ئێوارەیەك دا



﴿ ٱلنَّارُ يُعۡرَضُونَ عَلَيۡهَا غُدُوّٗا وَعَشِيّٗاۚ وَيَوۡمَ تَقُومُ ٱلسَّاعَةُ أَدۡخِلُوٓاْ ءَالَ فِرۡعَوۡنَ أَشَدَّ ٱلۡعَذَابِ واتە : ئاگری دۆزەخە ، بەیانیان و ئێواران نیشانیان دەدرێت ، یاخود پیایاندا دەچزێنرێت ، لە «جیهانی بەرزەخدا» رۆژی قیامەتیش فەرمان دەدرێت : ئادەی تاقم و دەستەی فیرعەون بخەنە ناو ئێش و ئازاری زۆر ناخۆشەوە ﴾ ﴿غافر: ٤٦﴾ .

قەتادە لەبارەی ئەم ئایەتەوە ئەڵێت : وەك سوکایەتی پێکردنێك و بەبچووك سەیر کردن ، پێیان ئەوترێت : ئەی دەست و پێوەندی فیرعەون ئەمە شوێنەکەتانە .

ئیبن سیرین ئەڵێت : ئەبو هورەیرە هەموو دوای عەسرێك ئەهاتە لای ئێمە ، ئەیوت : فریشتەکان بەرزبونەوە بۆ ئاسمان ، هەروەها دابەزینە سەر زەوی ، سزای ئاگریش نیشانی دەست و پێوەندی فیرعەون درا و پێیەوە سزادران ، (ئیبن سیرین ئەڵێت : لەو کاتەش هەر کەسێك گوێ بیستی قسەی ئەبو هورەیرە ئەبوو ئەوا یەکسەر داوای لە خوای گەورە ئەکرد کە بیپارێزێت لە سزای دۆزەخ) .

شعبە لە (یەعلا) کوڕی عطاء ئەگێڕێتەوە و ئەڵێت : گوێم لە میمون کوڕی مهران بوو ئەیوت : ئەبو هورەیرە عادەتی وەهابوو ئەگەر بەیانی هاتبایە ، ئەوا ئەیوت : ئەمڕۆش بەیانیمان کردەوە و سوپاس و ستایش بۆ خوای گەورە ، سزای دۆزەخیش نیشانی دەست و پێوەندی فیرعەون درا و بە هۆیەوە سزا دران (جا لەو کاتەش هەر کەسێك گوێی لەو وتەیەی ئەبو هورەیرە بوایە ئەوا لە خوای گەورە ئەپاڕیەوە تاوەکو لەم سزایەی بیپارێزێت .

هشیمی کوڕی یەعلا لە میمون ئەگێڕێتەوە و ئەڵێت : ئەبو هورەیرە لە هەر ڕۆژێکدا دووجار هاواری دەکرد. لە سەرەتای ڕۆژدا ئەیوت : شەو ڕۆیی ڕۆژ داهات دەست و پێوەندی فرعەون بە ئاگر سزادران . وە ئەگەر کاتێك شەو بهاتبایە ئەیوت : ڕۆژ ڕۆیشت شەو داهات دەست و پێوەندی فیرعەون بە ئاگر سزادران .

ئەگێرنەوە لە فەرموودەی (لیث) ، ئەویش لە ئەبو قیس، ئەویش (هذیل) ، ئەویش لە ئیبن مسعود ئەگێڕێتەوە ، کە ئەڵێت : گیانەکانی دەست و پێوەندی فیرعەون لەناو باڵندەیەکی ڕەشدایە ، هەمو ڕۆژێك دووجار ئەخرێنە سەر ئاگری دۆزەخ و نیشانیان ئەدرێت ، پێشیان ئەوترێت : ئەوە شوێنی ئێوەیە ، ئەمەش واتای ئەم فەرموودەیەی خوای گەورەیە کە ئەفەرموێت : ﴿ ٱلنَّارُ يُعْرَضُونَ عَلَيْهَا غُدُوًّا وَعَشِيًّا ... ﴾ ﴿غافر: ٤٦﴾ .

ئیبن ئەبو دنیا ئەڵێت : حمادی کوڕی محمد (الفزاری) بۆی گێڕاینەوە، وتی : لە (ئەوزاعی)ەوە پێم گەیشتوە ، لە ڕۆخی دەریادا جارێکیان پیاوێك پرسیارێکی لێکرد ، وتی : ئەی ئەبو عەمر ، ئێمە هەموو ڕۆژێك باڵندەیەکی ڕەش ئەبینین لەنێو دەریادا دێتە دەرەوە ، کاتێك شەویش دادێت هەمان شێوەی ئەم باڵندەیە بەڵام ڕەنگ سپی ئەگەڕێتەوە بۆ نێو دەریا . (ئەوزاعی)ش وتی : ئایا لە نهێنی ئەم باڵندەیە تێگەیشتن ؟ وتی : بەڵێ . ئەویش وتی : ئەم باڵندەیە گیانی دەست و پێوەندی فیرعەون ی دەنێوە خۆیدا هەڵگرتوە ، ئینجا کاتێك ئاگری دۆزەخی نیشان ئەدرێت و بەسەر ئاگرەکەدا ڕائەبرێت ئەوا ڕەنگی پەڕەکانی ڕەش ئەبێت ، پاشان ئەم پەڕانە فڕێ ئەدات ، بۆیە ڕەنگی وەکو خۆی لێدێتەوە ، دیسان بەسەر ئاگری دۆزەخ ڕائەبرێت و ڕەش ئەبێتەوە ، ئەمە بارودۆخی ئەم باڵندەیە تاوەکو ڕۆژی زیندووبونەوە ، هەروەها پێشی ئەوترێت : ﴿ ...أَدْخِلُوٓا۟ ءَالَ فِرْعَوْنَ أَشَدَّ ٱلْعَذَابِ ﴾ ﴿غافر: ٤٦﴾ .

لە ﴿صەحیح بوخاری و موسلیم﴾دا هاتوەو لە فەرموودەی ئیبن عمر (ڕەزای خوایان لێبێت) ، ئەویش لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) ئەفەرموێت : «هەر کەسێك لە ئێوە کاتێك ئەمرێت ، ئەوە بەیانیان و ئێواران شوێنەکەی نیشان ئەدرێت ، ئینجا ئەگەر لە خەڵکی بەهەشت بێت ئەوە بەهەشتی نیشان ئەدرێت ، بەڵام ئەگەر خەڵکی دۆزەخ بێت ئەوا دۆزەخی نیشان ئەدەن ، ئەمە بەردەوام ئەبێت تاوەکو خوای گەورە زیندوی ئەکاتەوە ، پێشی ئەڵێن : ئەمە شوێنی تۆیە هەتاوەکو خوای گەورە زیندووت ئەکاتەوە» . {بوخای و موسلیم گێڕاویتیانەوە} .

فوزەیلی کوڕی غزوان لە نافع ئەگێڕێتەوە ، ئەویش لە ئیبن عمرەوە (ڕەزای خوایان لێبێت) ئەگێڕێتەوە ، لە پێغەمبەری خوا (ﷺ) «هەر بەندەیەك کاتێك ئەمرێت ئەوە شوێنەکەی خۆی نیشان ئەدەن ، ئینجا ئەگەر خەڵکی بەهەشت بێت ئەوا بەهەشتی نیشان ئەدەن ، وە ئەگەر خەڵکی دۆزەخیش بێت ئەوا دۆزەخی نیشان ئەدەن» . {بوخاری و موسلیم گێڕاویەتیانەوە} .

❊ ❊ ❊

خوای گەورە ئەفەرموویت :﴿ فَلَوْلَآ إِذَا بَلَغَتِ ٱلْحُلْقُومَ ﴿٨٣﴾ وَأَنتُمْ حِينَئِذٍ تَنظُرُونَ ﴿٨٤﴾ وَنَحْنُ أَقْرَبُ إِلَيْهِ مِنكُمْ وَلَٰكِن لَّا تُبْصِرُونَ ﴿٨٥﴾ فَلَوْلَآ إِن كُنتُمْ غَيْرَ مَدِينِينَ ﴿٨٦﴾ تَرْجِعُونَهَآ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ ﴿٨٧﴾ فَأَمَّآ إِن كَانَ مِنَ ٱلْمُقَرَّبِينَ ﴿٨٨﴾ فَرَوْحٌ وَرَيْحَانٌ وَجَنَّتُ نَعِيمٍ ﴿٨٩﴾ وَأَمَّآ إِن كَانَ مِنْ أَصْحَٰبِ ٱلْيَمِينِ ﴿٩٠﴾ فَسَلَٰمٌ لَّكَ مِنْ أَصْحَٰبِ ٱلْيَمِينِ ﴿٩١﴾ وَأَمَّآ إِن كَانَ مِنَ ٱلْمُكَذِّبِينَ ٱلضَّآلِّينَ ﴿٩٢﴾ فَنُزُلٌ مِّنْ حَمِيمٍ ﴿٩٣﴾ وَتَصْلِيَةُ جَحِيمٍ ﴿٩٤﴾ إِنَّ هَٰذَا لَهُوَ حَقُّ ٱلْيَقِينِ ﴿٩٥﴾\واته: باشه : ئێوه بۆ بیر ناکەنەوه ، ڕۆژێك دێت كه : ڕۆحتان دەگاتە گەروتان * ئێوەش بەدەوری ئەوکەسەدا بێ دەسەڵاتانە تەماشادەکەن و سەرنج دەدەن * له کاتێکدا که ئێمه له ئێوه نزیکترین لێی ، بەڵام ئێوه نامانبینن * خۆ ئەگەر ئێوه زیندو ناکرێنەوه و پاداشت نادرێنەوه ... * ئەوه ڕۆحەتان دەگێڕایەوه ئەگەر ڕاست دەکەن و دەسەڵاتتان هەیە * جا ئەگەر ئەو کەسەی که له سەرەمەرگ دایه له نزیکان و خۆشەویستانی ئێمه بێت * ئەوه ئیتر خۆشی و کامەرانی و ئاسوودەیی بەهەشتی پڕله ناز و نیعمەت چاوەڕێیەتی * خۆ ئەگەر له دەستەی ڕاستانیش بێت * ئەوه لەلایەن دەستەی ڕاستانەوه سڵاوت پێشکەش دەکرێت * بەڵام ئەگەر له دەستەی ئەوانه بێت که گومڕان و بڕوایان به بەرنامەی خوا نیه ... * به ئاوی له کوڵ پێشوازی لێ دەکرێت ... * دەگەیەنرێتە دۆزەخ * بەڕاستی ئەوەی که باسمان کرد حەقیقەت و ڕاستەقینەیە و دوور له گومانه ﴾ ﴿الواقعه: ٨٣ -- ٩٥﴾ .

پێشەوا ئەحمەد له ڕێگای (همّام)ەوه دەریهێناوه ، ئەویش له عطاء کوری سائب ، ئەگێرێتەوه و ئەڵێت : گوێم له عبدالرحمن کوڕی ئەبو لیلی بو کاتێك بەدوای تەرمی مردوێکەوه بوو ، که بەرەو گۆڕستانیان ئەبرد ، وتی : فلانی کوری فلان بۆی گێڕامەوه، وتی : گوێم له پێغەمبەری خوا بو (ﷺ) ئەیفەرموو : «هەر کەسێك پێی خۆش بێت بگاتەوه خوای گەورە ، ئەوه خوای گەورەش پێی خۆشه پێی بگات ، هەر کەسێکیش پێی ناخۆش بێت بگاتەوه لای خوا ، ئەوه خوای گەورەش پێی ناخۆشه ئەو بەندەیە ببینێت» . بۆیە ئامادەبوانیش گریان . پێغەمبەریش

(ﷺ) فەرمووى : بۆچى دەگرن ؟ ئەوانيش وتيان : ئێمە مردنمان پێناخۆشە . ئەويش فەرمووى : وەها نيە ، بەڵكو لەكاتى سەرەمەرگ دا ئەگەر هاتوو ﴿ فَأَمَّآ إِن كَانَ مِنَ ٱلْمُقَرَّبِينَ ﴿٨٨﴾ فَرَوْحٌ وَرَيْحَانٌ وَجَنَّتُ نَعِيمٍ ﴿٨٩﴾ \ واتە : جا ئەگەر ئەو كەسەى لە سەرە مەرگدايە لە نزيكان و خۆشەويستانى ئێمە بێت ٭ ئەوە ئيتر خۆشى وكامەرانى و ئاسوودەيى بەهەشتى پڕ لە ناز و نيعمەت چاوەڕێيەتى ﴾ ﴿الواقعە: ٨٨ - ٨٩﴾ . ئينجا ئەگەر مژدەى بەم خۆشيە پێدرا ئەوە حەز ئەكات بگاتەوە بە خواى گەورە ، بۆيەش خواى گەورە پێى خۆشە پێى بگات . بەڵام ﴿ وَأَمَّآ إِن كَانَ مِنَ ٱلْمُكَذِّبِينَ ٱلضَّآلِّينَ ﴿٩٢﴾ فَنُزُلٌ مِّنْ حَمِيمٍ ﴿٩٣﴾ وَتَصْلِيَةُ جَحِيمٍ ﴿٩٤﴾ \ واتە : بەڵام ئەگەر لە دەستەى ئەوانە بێت كە گومڕان و بڕوايان بە بەرنامەى خوا نيە ... ٭ بە ئاوى لە كوڵ پێشوازى لێ دەكرێت ... ٭ دەگەيەنرێتە دۆزەخ ﴾ ﴿الواقعة: ٩٢ - ٩٤﴾ . بۆيە ئەگەر ئەم ناخۆشيەيان پێ ڕاگەياند پێى ناخۆشە بگاتەوە خواى گەورە ، بەهەمان شێوە خواى گەورەش نايەوێت ئەم بەندەيەى ببينێت . {أحمد گێراويەتيەوە ، سەنەدەكەشى بەهێزە} .

لە ﴿صەحيحى بوخارى﴾دا هاتووە، كە عوبادەى كورى "صامت" ئەگێڕێتەوە ، لە پێغەمبەرى خوا (ﷺ) كە ئەفەرموێت : «هەر كەسێك پێى خۆش بێت بگاتەوە خواى گەورە ، ئەوە خواى گەورەش پێى خۆشە پێى بگات ، هەر كەسێكيش پێى ناخۆش بێت بە ديدارى خواى گەورە شاد بێت ئەوا خواى گەورەش پێى ناخۆشە ئەو بەندەيە ببينێت» ، عائشە ، يان هەندێك لە خێزانەكانى وتيان : ئێمە مردنمان پێ ناخۆشە "ئايا ئەمەش ئەگرێتەوە" ئەويش فەرمووى (ﷺ) : «نەخێر وەها نيە ، بەڵكو كاتێك بڕوادار ئەگاتە سەرەمەرگ مژدەى ڕەزامەندى خواى گەورە و خۆشى بەهەشتى ئەدرێتێ ، بۆيە هيچ شتێك خۆشەويستر نيە لەوەى چاوەڕێى ئەكات ، هەر بۆيەش حەز ئەكات بگاتەوە لاى خواى گەورە ، بەهەمان شێوە خواى گەورەش حەز بە بينينى ئەكات . بەڵام مرۆڤى بێ باوەڕ كاتێك ئەگاتە سەرە مەرگ ، مژدەى سزاى خواى گەورە و ئاگرى دۆزەخى پێ ئەدرێت ، بۆيە هيچ شتێك لەوە ناخۆشتر نيە كە چاوەڕێى ئەكات ، هەر بۆيە پێى ناخۆشە

بگاتەوە خوای گەورە ، بەهەمان شێوە خوای گەورەش حەز بەبینینی ناکات» . {بوخاری و موسلیم گێراویەتیانەوە} .

لە فەرموودەی (زاذان)یش هاتووە ، ئەویش لە برائی کوری عازب ، ئەویش لە پێغەمبەری خوا (ﷺ) کە ئەفەرموویێت : «لە سەرەمەرگ دا بە گیانی بڕوادار ئەوترێت : ئەی گیانی دڵنیاو دامەزراو ، وەرە دەرەوە بۆلای لێ خۆش بون و ڕەزامەندی خوای گەورە ، ئینجا گیانەکەی وەکو ڕژانی دڵۆپێك ئاو لە کوپێکی ئاودا وەها بە ئاسانی لە لاشەکەی دێتە دەرەوە کە هیچ هەست بە ترس و لەرز ناکات . بەلاّم بە (گیانی) بێ بڕوا ئەوترێت : ئەی گیانی پیس وەرە دەرەوە بۆ لای سزاو تووڕەیی خوای گەورە ، لەو کاتەش دا جیا ئەبێتەوە لە لاشەکەی ، بەلاّم حەزناکات بێتە دەرەوە ، بۆیە ڕای ئەکێشن ، لەگەڵیشیدا ناوسکی دێتە دەرەوە» . {أحمد گێراویەتیەوە ، فەرموودەیەکی صحیح ە} .

لە گێڕانەوەی عیسای کوڕی (مسیب) ، ئەویش لە عودەی کوڕی (ثابت) ، ئەویش لە بەراء ، ئەویش لە پێغەمبەر (ﷺ) ئەفەرموویێت : «گیانی " بێباوەڕ" بە پێناخۆشیەوە لە لاشەکەی جیائەکرێتەوە ، وەکو چۆن ئاسنێکی بە پەلوپۆ لە نێو خوریدا کە کۆمەڵێك خوری لە گەڵ خۆی دێنێتە دەرەوە ، ئاوەها گیانی لە لاشەکەی دێننە دەرەوە» . {أحمد و بەیهەقی گێراویتیانەوە} .

لەو هەندێك ئایەتەکانی دیکەی قورئان بەڵگە هەیە لەسەر سزادانی نێو گۆڕ ، هەروەك خوای گەورە ئەفەرموێت : ﴿ ...وَلَوْ تَرَىٰٓ إِذِ ٱلظَّٰلِمُونَ فِى غَمَرَٰتِ ٱلْمَوْتِ وَٱلْمَلَٰٓئِكَةُ بَاسِطُوٓا۟ أَيْدِيهِمْ أَخْرِجُوٓا۟ أَنفُسَكُمُ ۖ ٱلْيَوْمَ تُجْزَوْنَ عَذَابَ ٱلْهُونِ بِمَا كُنتُمْ تَقُولُونَ عَلَى ٱللَّهِ غَيْرَ ٱلْحَقِّ وَكُنتُمْ عَنْ ءَايَٰتِهِۦ تَسْتَكْبِرُونَ ﴾ واتە : ... خۆ ئەگەر ئەو ستەمکارانە ببینی چۆن لە ئێش و ئازاری سەرەمەرگدا «گیریان خواردووە» فریشتەکانیش دەستیان لێدەکەنەوە و لێیان دەدەن و «پێیان دەڵێن» : ئادەی گیانتان بدەن بەدەستەوە ، دەی ڕۆحتان دەرکەن ، ئەمڕۆ لە تۆڵەی «خوا نەناسیتاندا» سزاو ئەشکەنجەی ریسوایی و شەرمەزاری دەدرێن ، چونکە شتی ناحەقتان بەدەم

خواوە هەڵدەبەست و خۆتان بەگەورە دەزانی لە بەرامبەر ئایەت و فەرمانەکانی خوادا و لووت بەرزیتان نەیدەهێشت باوەڕی پیٚ بهێنن ﴾ ﴿الأنعام: ٩٣﴾ .

ترمذی بە سەنەدەوە دەریهێناوە ، ئەگێڕێتەوە لە عەلی کە ئەفەرموویٚت : ئێمە هەر گومانمان لە سزای نێو گۆڕ هەبوو تاوەکو ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە کە ئەفەرمویٚت : ﴿أَلْهَىٰكُمُ ٱلتَّكَاثُرُ ۝١ حَتَّىٰ زُرْتُمُ ٱلْمَقَابِرَ ۝٢﴾ ﴿ التكاثر: ١ – ٢﴾ (واتە : «خەڵکینە !!» هەڵپەکردن و پێشبڕکێتان بۆ زۆرکردنی «ماڵ ومناڵ و سامان و کۆشك و تەلار و ... هتد» ئێوەی سەرگەرم و سەرگەردان و بیٚ ئاگا کردووە لە خواناسی و دینداری * تا ئەو کاتەی کە دەمرن و دەبرێنە گۆڕستان "دەخرێنە ناو گۆڕێکی تەنگ و تەسك و تارێکەوە ") . {ترمذی گێراویەتیەوە ، ئەڵێت : فەرموودەیەکی "حسن و غریب "ە} .

ئیبن حبان لە ﴿صەحیحەکەیدا﴾ دەریهێناوە لە فەرموودەی حمّاد کوری سەلەمە ، ئەویش لە محمد کوری عەمر ، ئەویش لە ئەبو سەلەمەوە ، ئەویش لە ئەبو هورەیرە ، ئەویش لە پێغەمبەر (ﷺ) کە لەبارەی فەرموودەی خوای گەورە ، کە ئەفەرموویٚت : ﴿... فَإِنَّ لَهُۥ مَعِيشَةً ضَنكًا وَنَحْشُرُهُۥ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ أَعْمَىٰ \ واتە : ... بێگومان بۆ ئەو جۆرە کەسانە ژیانێکی ترش وتاڵ و ناخۆش پێش دیٚت ، لە رۆژی قیامەتیشدا بە کوێری حەشر دەکرێن ﴾ ﴿کە: ١٢٤﴾ پێغەمبەر (ﷺ) ئەفەرمویٚت : ئەمە لەبارەی "سزای نێو گۆڕە" .

ئیبن مەسعود (ﷺ) ئەڵێت : کاتێك مرۆڤی بێباوەر ئەمرێت ، لە نێو گۆڕەکەیدا داینەنیشێنن ، پاشان پرسیاری لێنەکەن و پێی ئەڵێن : کیٚ پەروەردگارتە ؟ ئایینت کامەیە ؟ ئەویش ئەڵێت : نازانم . ئینجا گۆڕەکەی لیٚ تەسك ئەکەنەوە ، پاشان ئیبن مەسعود ئەم ئایەتەی خوێندەوە : ﴿... فَإِنَّ لَهُۥ مَعِيشَةً ضَنكًا وَنَحْشُرُهُۥ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ أَعْمَىٰ ﴾ ﴿ کە: ١٢٤﴾ ، دوایی وتی : ژیانی ناخۆش ، واتە : سزای نێو گۆڕ .

هەروەها لە ئیبن و عباس ەوە ئەگێرنەوە ، لەبارەی ئەم فەرموودەیەی خوای گەورە کە ئەفەرمووێت : ﴿ وَلَنُذِيقَنَّهُم مِّنَ ٱلْعَذَابِ ٱلْأَدْنَىٰ دُونَ ٱلْعَذَابِ ٱلْأَكْبَرِ لَعَلَّهُمْ يَرْجِعُونَ \ واتە : سوێند بە خوا ئێمە تاڵاو لە دونیادا دەکەین بە گەرویاندا ، بێجگە لە سزای ریشەکەنکردنیان ، بۆ ئەوەی هۆش و بیربکەنەوە و بیرێ: بکەنەوە و بگەڕێنەوە لای ئێمە ﴾ ﴿ السجدە: ٢١﴾ . ئیبن مەسعود ئەڵێت : ئەمە سزای گۆڕە .

هەروەها قەتادە و رەبیع کوری ئەنەس لەبارەی فەرمودەی خوای گەورە کە ئەفەرموێت : ﴿ ... سَنُعَذِّبُهُم مَّرَّتَيْنِ ... \ واتە : لە مەو دوا ئەوانە هەر لە دونیادا دوو جار ئازاریان دەدەین ، پاشان دەبرێنەوە بەرەو سزاو ئازارێکی زۆر سەخت و دژوار ... ﴾ ﴿التوبە: ١٠١﴾ . ئەڵێن : سزای یەکەمیان لە نێو دونیادایە ، ئەویدیکەشیان سزای نێو گۆڕە .

لە راستیدا فەرموودەی زۆر لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) لە رێگەی تەواتورەوە ، لەبارەی سزای گۆڕ و خۆپاراستن لێی گێردراونەتەوە .

لە ﴿صەحیحی بوخاری و موسلیم﴾دا هاتووە کە ئەگێرنەوە لە مسروق ، ئەویش لە عائشە (رەزای خوای لێبێت) کە پرسیاری لە پێغەمبەری خوا کردوە لە بارەی سزای نێو گۆڕ ، پێغەمبەریش (ﷺ) لە وەڵامدا فەرمووی : بەڵێ ، سزای نێو گۆڕ راستە . عائشەش وتی : بەردەوام پێغەمبەر (ﷺ) لە دوای نوێژەکان دوعای خۆپاراستن لە سزای نێو گۆڕی ئەکرد . {بوخاری و مسلم گێراویتیانەوە} .

دیسان لە ﴿صەحیحی بوخاری و موسلیم﴾دا ئەگێرنەوە لە (عمرە) ئەویش لە عائشە ئەگێرێتەوە و ئەڵێت : پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی : ئێوە لە نێو گۆڕدا ناخۆشیتان بەسەر دێت هەروەك ناخۆشیەکانی دەجال کە لە دوارۆژ بەسەر ئێوەدا دێت) . عائشە وتی : دوایی پێغەمبەری خوام (ﷺ) ئەبینی لە دوای ئەمەوە بەردەوام خۆی ئەپاراست لە سزاو ناخۆشیەکانی نێو گۆڕ .

له ﴿صەحیحی موسلم﴾ هاتوه ئیبن عباس ئەگێڕێتەوه کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) هەروەك چۆن سورەتی قورئانی فێرئەکردین وەهاش نزاو پاڕانەوەی فێر ئەکردین ، و ئەیفەرموو : (خودایا خۆم ئەپارێزم بە تۆ لە سزای دۆزەخ ، خۆم ئەپارێزم بەتۆ لە سزای نێو گۆڕ ، خۆم ئەپارێزم بەتۆ لە بەڵای دەجال ، خۆم ئەپارێزم بەتۆ لە بەڵاو ناخۆشیەکانی زیندووبونەوە و مردن). {موسلیم گێڕاویتیەوە}.

هەروەها لە ﴿صەحیحی موسلیم﴾ لە ئەبو هورەیرە ئەگێڕێتەوە ، کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمویەتی : «هەریەك لە ئێوە کاتێك لە تەحیاتی کۆتایی تەواو ئەبێت ، با بە خوای گەورە خۆی بپارێزێت لە چوار شت : لە سزای دۆزەخ ، لە سزای نێو گۆڕ ، لە بەڵای زیندوبوونەوە و مردن ، لە بەڵای مەسیحی دەجال» . {بوخاری گێڕاویەتیەوە}.

لە ﴿صحیحی موسلیم﴾ هاتوە لە زید کوری ثابت ئەگێڕنەوە ، کە ئەڵێت : کاتێك پێغەمبەری خوا (ﷺ) بەسەر پشتی وڵاغێکەوە لە نزیك دیواری (بنی نجار) بەرێدا ئەرۆیشت و ئێمەشی لەگەڵ بوین ، گەیشت بە شوێنێك لەوێدا وڵاغەکە ، کەمێك چەمووش بوو خەریك بوو پێغەمبەر لەسەر پشتی بکەوێتە خوارەوە ، پاشان سەیرمان کرد ئەم زەویە ، شەش یان پێنج یان چوار گۆڕی تێدایە ، فەرمووی : «کێ خاوەنی ئەم گۆڕانە ئەناسێت؟» پیاوێك وتی : من ئەیان ناسم . فەرمووی : «کەی ئەمانە مردون ؟» وتی : لە کاتی بتپەرستی دا مردوون . پێغەمبەریش (ﷺ) فەرمووی : «ئەم گەلە لەنێو گۆڕەکانیان دا سزاو ناخۆشیان بەسەر دێت ، خۆ ئەگەر لەبەر ئەوە نەبوایە کە مردوەکانیان نەئەشاردەوە ، ئەوە داوام لە خوای گەورە ئەکرد ئەو سزایەی من ئەی بیستم ئێوەش بیبیستن» ، پاشان ڕووی تێکردین و فەرمووی : «خۆتان بپارێزن بە خوای گەورە لە سزای دۆزەخ» ئەوانیش وتیان : خۆمان ئەپارێزین بە خوای گەورە لە سزای دۆزەخ . پاشان فەرمووی : «خۆتان بپارێزن بە خوای گەورە لە سزای نێو گۆڕ» ، ئەوانیش وتیان : خۆمان ئەپارێزین بە خوای گەورە لە سزای نێو گۆڕ ، دواتر فەرمووی : «خۆتان بپارێزن بە خوای گەورە لەو بەڵاو ناخۆشیەی کە دیارە و ئەوەشی کە نادیار و پەنهانە» ، وتیان : خۆمان ئەپارێزین بە خوای گەورە لەو بەڵاو ناخۆشیەی کە دیارە و ئەوەشی کە نادیار و پەنهانە . پاشان فەرمووی : «خۆتان بپارێزن

بە خوای گەورە لە بەڵا و ناخۆشی دەجال» ، ئەوانیش خۆیان پاراست بە خوای گەورە لە بەڵا و ناخۆشی دەجال . {مسلم گێڕاویەتیەوە} .

لە ﴿صەحیحی بوخاری و موسلیم﴾دا هاتووە لە فەرموودەی ئەبو ئەیوبی ئەنصاری ، ئەڵێت : کاتی ڕۆژئاوابون پێغەمبەر (ﷺ) هاتە دەرەوە ، گوێی لە دەنگێك بوو ، فەرمووی : «جولەکەیەکە لە نێو گۆڕەکەی سزا ئەدرێت» . {بوخاری و مسلم گێڕاویەتیانەوە} .

دیسان لە ﴿صەحیحی بوخاری و موسلیم﴾دا هاتوە لە ئیبن عباس ەوە ، ئەگێرنەوە : جارێك پێغەمبەر(ﷺ) بەلای دوو گۆڕدا تێپەری ، ئینجا فەرمووی : «هەردوکیان سزا ئەدرێن ، بەڵام لەسەر تاوانی گەورە نیە ، یەکێکیان لەسەر ئەوەیە خۆی لە پاشە میزکردن پاك نەئەکردەوە ، ئەویدیکەشیان دوزمانی ئەکرد» ، پاشان لکە دارێکی تەڕی هێنا و کردیە دوو پارچە ، هەریەکەو لەسەر گۆڕێکی دانا . ئەوانیش وتیان : ئەی پێغەمبەر(ﷺ) بۆچی وەهات کرد ؟ فەرموی : «تکا وایە تا ئەو دارانە ووشك ئەبن سزایان لەسەر سوك بێت» . {بوخاری گێراویتیەوە} .

ئەبو یەعلا موصلی و جگە لەویش لە فەرموودەی جابر دەریهێناوە ، لەفەرموودەکەش هاتووە : «بەڵام یەکێکیان لەپاش ملە باسی خەلکی ئەکرد» .

پێشەوا ئەحمەد و ئیبن ماجە لە ئەبو هورەیرە گێراویتیانەوە ، ئەویش لە پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی : «زۆرترینی سزای نێو گۆڕ بەهۆی خۆ پاك نەکردنەوەیە لە میز» ئەم فەرموودەیە بە مەوقوف لە ئەبو هورەیرە گێردراوەتەوە .

بەزار و حاکم لە فەموودەی ئیبن عباس گێراویەتیانەوە ، ئەویش لە پێغەمبەری خوا (ﷺ) کە ئەفەرمووێت : «بەزۆری سزای نێو گۆڕ لەسەر خۆ پاك نەکردنەوەیە لە میز ، کەوابو خۆتانی لێ پاك بکەنەوە» . {حاکم گێراویەتیەوە} .

طبرانی لە فەرمودەی ئەبو ئومامە دەریهێناوە ئەویش لە پێغەمبەر (ﷺ) ئەگێڕێتەوە کە ئەفەرمووێت : « خۆتان لەپاشە میز بپارێزن، ، چونکە یەکەمین شت لە نێو گۆڕدا بەندە لەسەری لێپرسینەوەی لەگەڵ دا بکرێت لە بابەت خۆ پاك نەکردنەوەیە لە میز» .

ئیبن عودەی لە فەرموودەی ئیبن عباس دەریهێناوە کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) جارێکیان بەلای چەند گۆڕێك دا تێپەری کرد یەکێکیان لەنێو گۆڕەکەی دا لەسەر دووزمانی کردن سزا ئەدرا ، ئەویدیکەشیان لەسەر (پاش ملە) باس کردنی خەڵکی و هەروەها ئەوەی تریشیان لەسەر خۆ پاك نەکردنەوە لە میز ، سزا ئەدرا .

هەندێك لە زانایان باسیان کردوە کە نهێنی تایبەت کردنی خۆ پاك نەکردنەوە لە میزو (پاش ملە) باسی خەلك کردن و دوزمانی لە سزای نێو گۆڕدا ، لەسەر ئەوەیە کە گۆڕ یەکەمین رۆژی زیندووبونەوەیە ، بۆیە جۆرێك (یان نموونەیەك)لەسزاو پاداشتی رۆژی دوایی تێدایە.

ئەو تاوانانەی بەندە لەسەری سزا ئەدرێت دوو جۆرن : مافی خوای گەورە و مافی بەندەکان . یەکەمین مافی خوا لە رۆژی دوایی دا کە بەندە لەسەری سزا بدرێت لە بابەت نوێژەوەیە ، هەروەها یەکەمین مافی خەڵکیش خوێن رشتنە بە نارەوا .

بەڵام لە ژیانی نێوبەند"بەرزەخ"دا لەسەرەتادا ئەم دوو جۆرە بابەتانەی تێدا سزا ئەدرێت ، چونکە سەرەتای ئەنجام دانی نوێژ خۆ پاك کردنەوەیە لە میز و پیسایی ، هەروەها سەرەتای خوێن رشتنیش دووزمانی و باسی خەڵك کردنە لە پاش ملە ، ئەم دووانەش (واتە خۆ پاك نەکردنەوە و دوزمانی کردن) ئاسانترین جۆرەکانی ئازاردانی خەڵکیە ، بۆیە لە ژیانی نێوبەندا یەکەمین شت کە بەندە لەسەری لێپرسینەوەی لەگەڵ بکرێت و لەسەریشی سزا بدرێت ئەم دووانەن .

عبدالرزاق لە موعەمەر ئەگێرێتەوە ، ئەویش لە ئەبو ئیسحاق ، هەروەها لە ئەبو مەیسەرە ئەویش لە عەمر کوڕی شەرحەبیل ئەگێرێتەوە و ئەڵێت : پیاوێك مرد پاش ئەوەی خستیانە نێو گۆڕەکەی فریشتەی پرسیارکەر هاتنە لای ، پرسیاریان لێکرد و ، وتیان : ئێمە سەد قامچییت لێ ئەدەین ئەمە سزای خوای گەورەیە بۆ تۆ ، ئەویش باسی ئەنجام دانی نوێژ و رۆژوو تێکۆشانی خۆی بۆ فریشتەکان کرد تاوەکو سزاکەی لەسەر سوك بکەن . وتی : ئینجا لەسەریان سوك کرد تا گەیاندیانە یەك قامچی , قامچیەکیان لێدا بەهۆیەوە گۆڕەکەی هەمو بووە ئاگر ، لەهۆش خۆی چوو ، دوای ئەوەی کە هاتەوە هۆش خۆی پرسی ، ئایا لەسەر چ کارێك لێتان

دام ؟ ووتیان : ڕۆژێکیان بەبێ دەست نوێژ نوێژت ئەنجام داوە ، هەروەها ڕۆژێکیان ستەم لێکراوێکت بینی و داوای یارمەتی لێکردی ، تۆش بەهانایەوە نەهاتی .

کەوابوو ئالێرەدا سزای گۆڕ بە هۆی دووشت ڕووی داوە : یەکەمیان : وازهێنان لە دەست نوێژ هەلگرتن، دوەمینیان : یارمەتی نەدانی ستەملێکراو لەگەڵ ئەوەی کە تواناشت هەبوە ، هەروەك لە فەرموودەی پێشتریش سزای نێو گۆڕ بەهۆی واز هێنان بوو لە خۆ پاك کردنەوە لە پیسی و ستەم کردن بوو بەوتەو گوفتار ، کە نزیکە لە واتا و مەبەستی ئەم فەرموودەیە .

لە فەرمودەی عبدالرحمن کوری سمرە ، ئەویش لە پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەگێرێتەوە کە ئەفەرمووێت : «ئەم شەو کۆتایی هەمو شتەکانم بینی» ، فەرمودەکەی بەدرێژی باس کرد ، تێیدا هاتبوو : «پیاوێکم لە گەلەکەی خۆم بینی سزای نێو گۆڕیان ئەدا ، ئینجا دەست نوێژ شتنەکەی هات و لەم سزایەی ڕزگاری کرد» . {طبراني و جگە لەویش دەریهێناوە} .

کەوابو لەم فەرموودەیەدا ، پاك و خاوێنی لە بێ دەست نوێژی ، لە سزای نێو گۆڕ ڕزگاری ئەکات .

بەهەمان شێوە فەرمان کردن بەچاکە و ڕێگری کردن لەخراپە ، لە سزای نێو گۆڕ ڕزگاری ئەکات ، هەروەك لەبەشی دووەم باس کراوە ، لەبەر ئەوەی سوود گەیاندن بەخەڵکی مەبەستی سەرەکی ئایینە.

بەهەمان شێوە تێکۆشان و ئێشك گرتن لە بەرەی جەنگ لە پێناوی خوای گەورەدا چونکە لە هەردووکیان خۆبەخشینیان تێدایە ، ئەویش لەپێناو بەرز کردنەوەی (ئاییـنی) خوا ، مەبەست لە ئاینیش لێرە بەڕوونی دیارە ، هەروەها لەپێناو ڕاونانی دووژمنان و دور خستنەوەیان بوو لەسەر بڕواداران .

ترمذی لە میقدام کوڕی مەعدی (کەریبە) ئەگێرێتەوە ، ئەڵێت : پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەفەرمووێت : «شەهیدان شەش تایبەتمەندیان لە لای خوای گەورە هەیە ، کە هیچ کەسێك ئەو تایبەتمەندیانەیان نیە ، تایبەتمەندیەکانیش بریتین : لەکاتی ڕژانی یەکەم دڵۆپە خوێنیان ئەوا خوای گەورە لێیان خۆش ئەبێت ، هەروەها ئەو شوێنەی لەناو بەهەشت دا بۆیان دیاری کراوە لە

کاتی شەهید بونیان دا خوای گەورە پیشانیان ئەدات ، لە سزای گۆڕ سەلامەت و دڵنیا ئەبن ، لە ناخۆشی گەورە لە ڕۆژی لێپرسینەوەدا سەلامەت و دڵنیا ئەبن» . مایەوەی فەرمودەکەی بەدرێژی باس کرد . {ترمذي گێراویتیەوە ، فەرموودەیەکی حسن ە} .

لە ﴿صەحیحی موسلیم﴾دا هاتوە سەلمان لە پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەگێڕێتەوە ، کە ئەفەرموێت : «ئێشك گرتن لەپێناو خوای گەورە لەبەرەی جەنگ دا خێری لە بەڕۆژوو بوونی مانگێك و شەونوێژی هەمان مانگ بەیەکەوە زیاترە ، خۆ ئەگەر لەو کاتەدا بمرێت هەر کردەوەیەکی لەبەر ئەم ئێشك گرتنە لە دەست چوبێت ، ئەوا لە جیاتی لە دەست چونەکەی خوای گەورە پاداشتی ئەکاتەوە ، بەهەمان شێوە پاداشتی لە دەست چوونی رزق و ڕۆزیەکەشی ئەداتەوە ، سەلامەت و دڵنیاشی ئەکات لە ناخۆشیەکانی دوا ڕۆژ» . جگە لە ﴿صەحیحی موسلیم﴾ ئەوانی دیکەش ئەم فەرمودەیان گێراوەتەوە، و تێیدا هاتووە : «لە سزای گۆڕیش پارێزراو ئەبێت» . {موسلیم گێراویەتیەوە} .

نەسائی دەریهێناوە لە فەرموودەی راشد کوری سەعد ، کە ئەگێڕێتەوە و ئەڵێت : جارێکیان پیاوێك لە هاوەڵەکانی پێغەمبەر (ﷺ) ئەگێڕێتەوە و ئەڵێت : پیاوێك لە پێغەمبەری خوای (ﷺ) پرسی : ئەی پێغەمبەری خوا ! بۆچی هەمو بڕواداران توشی ناخۆشیەکانی ناو گۆڕ ئەبن تەنها شەهیدان نەبێت ؟ ئەویش فەرمووی (ﷺ) : «مەترسی و ترس و لەرزی ئەو شیە " یان ئەو چەکەی" پێی شەهید ئەکرێت بەسسە بۆ ئەو , نەوەك زیاتری بەسەر بێت» . {نەسائی گێراویتیەوە ، سەنەدەکەشی حسن ە} .

* * *



# وچانێك
# لەبارەی سزای ناو گۆڕ

لەبارەی سزای نێو گۆڕەوە ، زانایان دوو جۆریان باس کردوون :

لەوانە : لێدانە بە پارچەیەك ئاسن یاخود جگە لە ئاسن ، پێش ئێستا چەند فەرموودەیەکمان لەمبارەیەوە باس کردوە .

ئیبن جەریر لە تەفسیرەکەیدا ئەگێڕێتەوە لە ڕێگای ئەسباط ، ئەویش لە (السدی) ئەگێڕێتەوە ، و ئەڵێت : بەرائی کوری عازب ئەڵێت : کاتێك مرۆڤی بێباوەڕ ئەمرێت و ئەخرێتە ناو گۆڕ ، بە فەرمانی خوای گەورە (ﷻ) گیانلەبەرێکی زۆر مەترسیداری بۆ دێت ، چاوەکانی یەك پارچەن لە مس ، پارچەیەك ئاسنی درێژی پێیە ، ئینجا یەك پیاکێشانی لەناو شانەکانی ئەدات ، لەتاو ئێش و ئازارەکانی جەستەی هاوارێك ئەکات ، ئەوەندە ناخۆش و گەورەیە هەر بونەوەرێك کە ئەیبیستێت ئەوا نەفرینی لێ ئەکات ، لەو کاتەش دا هەمو بونەوەرێك جگە لە مرۆڤ و جنۆکە نەبێت ئەگەر نا هەموویان ئەیبستن.

لە ڕێگای جوەیبیر ئەویش لە ضحاك ئەگێڕێتەوە ، و ئەڵێت : کاتێك بێباوەڕ ئەخرێتە ناو گۆڕەکەی ، لێدانێکی بەهێزی لێ ئەدەن ، لە تاو ئێش و ئازارەکانی جەستەی هاوارێکی زۆر بەهێز ئەکات ، ئەوەندە بەهێزە هەموو بونەوەرێك جگە لە مرۆڤ و جنۆکە نەبێت ئەگەر نا هەموویان ئەم دەنگە ئەبیستن، هەر بونەوەرێك یان شتێك کاتێك دەنگی هاوارە ناخۆشەکەی ئەبیستێت نەفرینی لێ ئەکات .

لالکائی بەسەنەدەوە لە محمد کوری مکەندەر ئەگێڕێتەوە ، و ئەڵێت : پێیانووتووم کە خوای گەورە لەناو گۆڕی بێباوەڕەکان ، گیانلەبەرێکی کوێری مەترسیداری بێ میهرەبانی بەسەردا زاڵ ئەکات ، پارچەیەك ئاسنی درێژی بە دەستەوەیە ، سەرەکەی وەکو سەری وشتر وایە ئینجا تاوەکو ڕۆژی زیندووبونەوە هەر لێی ئەدات ، گیانلەبەرەکە نەئەبیستێت , نەگوێشی لە هاوار و ناڵەکەیەتی تاوەکو میهرەبانی لەگەڵ بنوێنێت ، بۆیە بێباوەڕەکە تاوەکو ڕۆژی زیندووبونەوە هەر لەژێر سزا و ئازاردا ئەمێنێتەوە .

لە جۆرەكانی سزای ناوگۆر هەندێكیان بریتین لە زاڵ كردنی مار و دووپشك بەسەر سزادراوەكە ، ئەمەش لە فەرمووودەی ئەبو هورەیرە دا باس كراوە . ئیبن وەهەب ئەگێرێتەوە و ئەڵێت : عەمر كوڕی حارث بۆی گێڕامەوە ، كە (ئەبو سمح) لە ئەبو حوجەیرە ئەگێرێتەوە . ئەویش لە ئەبو هورەیرە ، ئەویش لە پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەگێرێتەوە ، كە جارێكیان لەناو هاوەڵەكانی دا ئەفەرمویێت : « ئایا ئەزانن ئەو ئایەتە - ﴿...فَإِنَّ لَهُۥ مَعِيشَةً ضَنكًا...﴾ ﴿طه: ١٢٤﴾ لەبارەی "كێ"وە هاتۆتە خواردوە ، هەروەها ئەشزانن واتا و شێوەی (المعيشة الضنك - ژیانیكی ترش و تاڵ) چۆنە ؟» ئەوانیش ئەڵێن : خوا و پێغەمبەرەكەی ئەزانن . پێغەمبەریش (ﷺ) فەرموی : «ئەوە سزای بێباوەڕە لەناو گۆڕ . سوێند بەو كەسەی گیانی منی بەدەستە ، بێباوەڕ لەناو گۆڕدا نەوەد و نۆ ئەژدیهای بەسەر دا زاڵ ئەكرێت ، ئایا ئەزانن ئەم ئەژدیهایانە چۆنن؟ فەرمووی : نەوەد و نۆ مارن ، هەر مارێكیش حەوت سەری هەیە» . لە گێرانەوێەكی دیكەدا ئەفەرموویێت : «نۆ سەریان هەیە ، بەردەوام تاوەكو ڕۆژی زیندوبونەوە پێی وەئەدەن و ئازاری جەستەی ئەدەن» . {"بەقی"كوری مخلد لە موسنەدەكەی گێراویەتیەوە} .

ئەبو سەعید ئەگێرێتەوە ، و ئەڵێت : پرسیاریان لەبارەی (المعيشة الضنك - ژیانێكی ترش و تاڵ) لێكرد ، ئەویش وتی : ژیانی مرۆڤی بێباوەڕە لەناو گۆڕ ، خوای گەورە حەفتاو دوو مار و دووپشكی بەسەردا زاڵ ئەكات ، وەكو ئێستر گەورەن ، تاوەكو ڕۆژی زیندوبونەوە ئازاری ئەدەن و پێیوە ئەدەن ، هەروەها سەرەڕای ئەم ئازارە گۆڕەكەشی لێ تەسك ئەبێت بەشێوەیەك پەراسوەكانی دەناو یەك دا ئەچەقن، بۆیە بێباوەڕەكە خۆزگە ئەخوازێت لەم سزایەی ناو گۆڕ ڕزگاری ببوایە و چوبایە ناو ئاگری دۆزەخ .

لە فەرمووودەی سەمرەی كوری جوندوب لە پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەگێرێتەوە ، كە ئەفەرموویێت : «لە شەودا دوو پیاوم بینی كە هاتنە لام ، ئنجا دەستی منیان گرت ، بردمیانە زەویەكی پیرۆز ، لەوێ پیاوێكی دانیشتووی لێبو ، هەموو جار پارچەیەك ئاسنیان لە لایەكی روومەتی ڕائەكرد هەتا لە پشتی ئەهاتە دەرەوە ، پاشان بەهەمان شێوە خەریك بوون ئازاری ڕوومەتی دیكەیان ئەدوە لە هەركاتێك خەریكی ئازاردانی كامە ڕومەت بووبان، ئەویتر چاك ئەبوەوە ، ئینجا ئەچوونە لای ئەو ڕومەتەی كە چاك بۆتەوە ، بەهەمان شێوە دوبارە و سێبارە

بەردەوام بەمجۆرە ئازاری پیاوەکەیان ئەدا . منیش وتم : ئەمە بۆچی سزا ئەدرێت ؟ دوو پیاوەکەی لەگەڵم بوون وتیان : بابڕۆین ، ئەوسا ڕۆیشتین ، هەتاوەکو گەیشتینە لای پیاوێك لەسەر پشتی ڕاکشابوو ، هەروەها پیاوێکیش لەنزیکی یەوە بە پێوە وەستا بوو ، بەردێکی گەورەی بەدەستەوە گرتبوو، لەسەری کەسە ڕاکشاوەکەی ئەدا ، هەرکاتێکیش کە لەسەری ئەدا بەردەکە کەمێك دوور ئەکەوتەوە لێیان ، هەروەها لەبەر بەهێزی پیاکێشانەکە سەری کەسە ڕاکشاوەکە پان ئەبوەوە ، ئنجا ئەوەی کە بە پێوە وەستابو ئەچو بەردەکە بهێنێتەوە ، لەگەڕانەوەیدا ئەیبینی سەری کەسە پاڵ کەوتووەکە چاك بۆتەوە ، بۆیە بەردێکی بەهێزی دیکەی وەکو جاری پێشووی لێ ئەدا ، ئەم لێدانەی و پاشان چاك بونەوەی سەر و هێنانەوەی بەردەکە و دوایی دوبارە وسێبارە هەمیشە بەردەوام ئەبو ، بەمجۆرە پیاوە ڕاکشاوەکە سزا ئەدرا ، منیش وتم : ئەمە چیە ؟ ئەوانیش پێیانووتم : بابڕۆین ، ڕۆیشتین ، گەیشتینە چاڵێکی گەورەی وەك چاڵی تەنور سەرەوەی تەسك و خوارەوەی فراوان بو ، لەژێریشی ئاگرێکی بەهێز هەڵکرابوو، کۆمەڵێك پیاو و ژنی ڕووت لەناو ئاگرەکە سزا ئەدران ، هەرکاتێك تین و گەرمایی ئاگرەکە زیادی ئەکرد ئەوان ڕایان ئەکردە سەرەوە ، ئەوەندە ئەچونە سەرەوە خەریك ئەبون لەناو چاڵەکە بچنە دەرەوە ، بۆیە کاتێك نزیك ئەکەوتنەوە ئاگرەکەیان بێ هێز ئەبوو و ئەوانیش ئەگەڕانەوە شوێنی خۆیان ، بەمشێوەیە بەردەوام سزا ئەدران ، منیش وتم : ئەمانە چین ؟ دوو پیاوەکەی لەگەڵم بون ووتیان : بابڕۆین ، ڕۆیشتین هەتاوەکو گەیشتینە سەر ڕووبارێکی سور هەموو لە خوێن بوو، لەناو ڕووبارەکە پیاوێکی وەستاوی لێبو ، لەسەر ڕۆخەکەشی پیاوێکی دیکەی لێبو ، بەردێکیشی بەدەستەوە بوو، ئینجا ئەچوە لای ئەو پیاوەی کە لەناو ڕوبارە خوێنینەکە بوو ، هەر کاتێکیش پیاوەکەی ناو ڕووبارەکە ویستبای لەناو ئەم ناخۆشیە بهاتبایەتە دەرەوە ، ئەوە پیاوەکەی دەرەوە بەردێکی بەهێزی لێ ئەدا ، بۆیە پیاوەکە یەکسەر لەبەر ئێش و ئازاری ئەگەڕایەوە ناو ڕوبارەکە ، ئەمە بەردەوام ئەبو هەر کاتێك کە پیاوەکەی ناو ڕووبارەکە ویستبای لەناو ڕووبارەکە ڕایبکردبا ، بەردێکی بەهێزی لێ ئەدرا و ئەگەڕایەوە شوێنی خۆی ! منیش وتم : ئەمە بۆچی سزا ئەدرێت ؟ ئەوانیش پێیانووتم : بابڕۆین» . فەرموودەکەی بەدرێژی باس کرد . تێیدا هاتوە : «لە کۆتاییەکەی منیش بە هەردوکیانم وت : ئێوە ئەمشەو منتان بردە ، دەرەوە ئەمانەتان نیشان دام بۆیە پێمبڵێن بۆچی ئەمانە بەمشێوەیە

ڕەها سزا و ئازار ئەدرێن ، ئەوانیش وتیان : بەڵێ "ئینجا باسیان کرد و هۆکاری سزا دانی ئەمانەیان بۆ باس کردم و" وتیان : ئەو پیاوەی کە هەمو کات ڕومەتەکانی پارچە ئەکرا پاشان وەکو خۆی لێ ئەهاتەوە ، ئەوە کەسێك بو بەردەوام لەناو قسەکانی دا درۆی ئەکرد ، بۆیە تاوەکو ڕۆژی زیندوبونەوە بەمشێوەیە سزا ئەدرێت . بەڵام لەبارەی ئەو پیاوەی کە بە لێدانی بەرد لەسەری سزایان ئەدا ، بەم هۆیەوەش سەری پان ئەبوەوە ، پاشان چاك ئەبوەوە ، دیسان لێیان ئەداوە ، ئەمە پیاوێکە خوای گەورە (ﷻ) قورئانی فێرکردوە ، بەڵام ئەو پیاوە لەژیانی ڕۆژانەیدا کاریٚ پێ نەکردوە ، بەڵکو پشت گوێی خستبو . سەبارەت بە پیاو و ژنانەی ناو چاڵە ئاگرەکەش ، ئەوان داوێن پیس و زیناکەر بون . ئەوەی لەناو ڕوبارە خوێنینەکەش بو ، ئەوە کەسێکی ریبا خۆر بوو» . فەرمودەکەی بە درێژی باس کرد . {بوخاری دەریهێناوە} .

ئەم فەرموودەیە ئەبو خەلدە لە ئەبو حازم ، ئەویش لە سەمرە ئەگێرێتەوە ، لە فەرموودەکەش دا هاتوە : «ئەی ئەو کەسەی لەناو خوێن دا مەلە ئەکات ، بۆچی وەها سزا ئەدرێت ؟ ووتی : کەسێکی ریبا خۆرە ، ئەمە خواردنیەتی تاوەکو ڕۆژی زیندوبونەوە. وتم : ئەی ئەوەی هەموو جار بە بەرد لەسەریان ئەدا ؟ وتی : پیاوێکە خوای گەورە قورئانی فێرکردوە ، شەو لێی خەوتوە و هیچی لیٚ نەخوێندوە ، تاوەکو لەبیری چۆتەوە ، بۆیە تاوەکو ڕۆژی زیندوبونەوە ئەمە سزاکەیەتی هەرکاتێك ، ئەیەوێت بنوێت بەردێکیٚ بەهێزی لەسەری ئەدەن، و ناهێڵن بخەوێت» .
لەباسی سزای ناو گۆڕدا هاتوە : تەسك بونەوەی گۆڕە لەسەر مردو بەشێوەیەك تا پەراسوەکانی دەناو یەکدا ئەچەقن . لەمبارەیەوە فەرمودەی زۆرمان باس کردوە .

ئەوە هەیە ئەو فەرمودانەی لەبارەی تەسك بونەوەی گۆڕدا هاتوون ، بەشێوەیەکی گشتیە "واتە بێباوەڕ و بڕوادار ئەگرێتەوە" لەمبارەیەوە کۆمەڵێك لە زانایان لەوانە : کوری بطوطە و جگە لەویش باسیان کردوە . بۆنموونە: شوعبە لە سەعد کوری ئیبراهیم ، ئەویش لە نافع ، ئەویش لە عائیشە (خوا لێی ڕازی بێت) ئەگێرێتەوە , و ئەڵێت : پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەفەرموێت : «گۆڕ پاڵەپەستۆ و تەسك بونەوەیەکی بەهێزی هەیە ، هەمو کەسێك ئەگرێتەوە ، خۆ ئەگەر یەکێك ڕزگار ببوایە لەم ناخۆشی تەسك بونەوەیەدا، ئەوا سەعد کوری معاذ لێی ڕزگار ئەبوو». پێشەوا ئەحمەد دەریهێناوە . {فەرمودەیەکی حسن ە} .

نەسائی لە فەرموودەی عبیداللە کوڕی عمر کوری نافع ، ئەویش ئەگێڕێتەوە لە عبداللە کوری عمر (ﷺ) ئەڵێت : پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەفەرموویت : «ئەوەی "واتە : معاذ" لەکاتی مردنیدا عەرشی خوای بۆ وەجوڵە کەوت و لەرزی ، دەرگاکانی بەهەشتیشی بۆ کرایەوە ، لەوکاتەشدا حەفتا فریشتەش ئامادە بوون ، لەناو گۆڕدا "گۆڕی" لەسەر تەسك بوەوە و وێکهاتەوە پاشان لێی رزگاری بوو» . {نەسائی گێراویتیەوە ، فەرموودەیەکی حسن ە} .

پێشەوا ئەحمەد و نەسائی لە جابر ئەگێڕنەوە ، و ئەڵێت : کاتێك سەعد مرد و لەناو گۆڕدا نێژرا ، پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەبارەیەوە فەرمووی : «پاکی و بێگەردی بۆ خوا ، ئەم بەندە چاکە "واتە : سەعد" عەرشی خوای بۆ وەجوڵە کەوت و هاتە لەرزین ، دەرگاکانی بەهەشتی بۆ کرانەوە ، سەرەڕای ئەمانە گۆڕی لێ تەسك بوەوە ، پاشان لێی ڕزگار بوو» . {ئەحمەد گێراویەتیەوە ، فەرموودەیەکی صەحیحە} .

ئیبن ئەبو دنیا ئەگێڕێتەوە لە عبیداللە نوری محمدی تەمیمی ، کە ئەڵێت : گوێم لە ئەبوبەکری تەیمی بوو " زانایەك بوو لە قورەیش" ئەیووت : بۆیە تەسك بونەوەی گۆڕ هەموو کەسێك ئەگرێتەوە بێ جیاوازی چونکە لە بنچینەدا گۆڕ دایکیانە ، هەر لەویش دروست کراون ، پاش ئەوەی کە دێنە سەر دنیا ماوەیەکی درێژ لێی دائەبڕێن ، بەڵام پاش ئەوەی منداڵەکانی بۆ ئەگەڕێننەوە "واتە : ئەمرن و ئەخرێنە ناو گۆڕ" وەکو دایکێکی بەسۆز کاتێك منداڵێکی ماوەیەکە لەبەرچاوان نیە باوەشی پیا ئەکات و ئەیگوشێت ، ئینجا هەر کەسێك فەرمانەکانی خوای گەورەی (ﷻ) جێبەجێکردبێت ، ئەوە باوەش پیاکردنەکەی بە سۆزو نەرمیەوەیە ، بەڵام ئەوەی لە فەرمانەکانی خوای گەورە (ﷻ) دەرچوبێت ، ئەوە باوەش پیاکردنەکەی بە ئازار و ناخۆشە .

لە پەرتووکی ﴿المحتضرین﴾ بەسەنەدەوە ئەگێڕێتەوە لە عبدالعزیز کوری ئەبو رواد ، ئەویش لە نافع ئەگێڕێتەوە ، کاتێك دێتە سەرەمەرگ ئەگریێت ، ئەوانەی لەوکاتەش لەوێن پێی ئەڵێن : بۆچی ئەگرییی ؟ نافعیش ئەڵێت : سەعد و تەسك بونەوەی گۆڕم بە بیر هاتەوە .

هەنناد کوڕی سری لە سەعید کوری دینار ئەگێڕێتەوە ، ئەویش لە ئیبراهیم غەنەوی ، ئەویش لە عائیشە (ڕەزای خوای لێبێت) ئەگێڕێتەوە ، کە جارێکیان تەرمی منداڵێکیان بەنزیك

ئەودا دەبرد بۆ گۆڕستان ، ئەویش کاتێك تەرمی منداڵەکە ئەبینێت ئەگرێت ، پاشان ئەڵێت : بۆ ئەو منداڵە گریام ، وەك دەربڕینی هەست و سۆز بۆی چونکە لەناو گۆڕدا ، گۆڕەکەی لێ تەسك ئەبێتەوە .

هەروەك پێشەوا ئەحمەد و بوخاری دەریانهێناوە لە فەرموودەی عبداللە کوری عەمری کوری عاص ، ئەویش لە پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەگێڕێتەوە ، و ئەفەرموێت : «هەر موسڵمانێك لە شەوی هەینی "جمعە" یاخود لە ڕۆژەکەی بمرێت ئەوا لە ناخۆشیەکانی ناو گۆڕ ڕزگاری ئەبێت» . {ئەحمەد گێراویتیەوە ، فەرمودەیەکی حسن ە} .

❊ ❊ ❊

## وچانێك

## باسی خۆشیەکانی ناو گۆڕ

لەبارەی خۆشیەکانی ناو گۆڕ ئەم فەرمودەیەی خوای گەورە (ﷻ) بەڵگەیە: ﴿ فَأَمَّآ إِن كَانَ مِنَ ٱلْمُقَرَّبِينَ ﴿٨٨﴾ فَرَوْحٌ وَرَيْحَانٌ وَجَنَّتُ نَعِيمٍ ﴿٨٩﴾ \ واتە : جا ئەگەر ئەو کەسەی کە لە سەرەمەرگدایە لە نزیکان و خۆشەویستانی ئێمە بێت ❊ ئەوە ئیتر خۆشی و کامەرانی و ئاسوودەیی بەهەشتی پڕ لە نازو نیعمەت چاوەڕێیەتی ﴾ ﴿ الواقعە: ٨٨ – ٨٩﴾ ، هەروەك لە پێش دا باس کراوە .

کوڕی وەهەب ئەگێڕێتەوە ، ئەڵێت : عەمر کوری حارث بۆی باس کردم کە ئەبو سەمحی (الدراج) لە کوری حوجەیرە ئەگێڕێتەوە ، ئەویش لە ئەبو "هورەیرە"وە ئەگێڕێتەوە و ئەڵێت : پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەفەرموێت : «بڕوادار لەناو گۆڕەکەیدا وا لەناو مێرگێکی سەوزایی دایە ، هەروەها گۆڕەکەی بە ئەندازەی حەفتا باسك فراوان ئەکەن ، وەکو ڕووناکایی مانگی چواردە شەوە بۆی ڕوناك ئەکەنەوە» . {سەندەکەی لاوازە} .

لە کوری عمر ئەگێڕنەوە ، ئەڵێت : پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەفەرموێت : «گۆڕی مرۆڤ باخچەیەك لە باخچەکانی بەهەشتە ، یان چاڵێکە لە چاڵەکانی دۆزەخ» . {سەنەدەکەی لاوازە} .

❊ ❊ ❊

## بەشی حەوتەم

# لەبارەی بەیەکگەیشتنی گیانی مردوان لە بەرزەخ دا

موسلیم کوڕی ئیبراهیمی وەراق لە ئەبو قەتادە ئەگێڕێتەوە ، ئەویش لە پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەگێڕێتەوە کە ئەفەرموێت : «ئەگەر هەرکاتێك برایەکتان مرد کفنێکی جوانی بۆ بکەن ، چونکە لەناو گۆڕدا سەردانی ئەکەن» . ئیبن ئەبو دنیا دەریهێناوە ، هەروەها ترمذي و ئیبن ماجە گێراویتیانەوە لە ڕێگەی عمر کوری یونس ، ئەویش لە عەکرەمە گێراویەتیەوە ، بەڵام ئەوە هەیە ئەم دەستەواژەیەی ئەفەرموێت : «چونکە لەناوگۆڕدا سەردانی ئەکەن» تێدا نیە . {ترمذي گێراویتیەوە ، فەرمودەیەکی صەحیحە} .

هەروەها ئەگێڕێتەوە لە فەرموودەی محمد کوری موصەفا ، ئەویش لە جابر ، ئەویش لە پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەگێڕێتەوە ، کە ئەفەرموێت : «با کفنی مردوەکانتان جوان و ڕێك بێت ، چونکە لەناو گۆڕدا شانازی پێوە ئەکەن و سەردانی یەکتری پێ ئەکەن» .

ئیبن ئەبو دنیا ئەڵێت : قاسم کوری هاشم بۆی باس کردین ، ئەویش لە راشد کوری سەعد ئەگێڕێتەوە ، کە ئەڵێت : جارێکیان پیاوێك خێزانەکەی ئەمرێت ، لە شەودا خەونێك ئەبینێت تیایدا کۆمەڵێك ژن ئەبینێت بەڵام سەرنج ئەدات خێزانەکەی ئەوی تێدانیە ، ئەویش پرسیاری نەهاتنی خێزانەکەی خۆی لە ئەوان ئەکات ، ئەوانیش لە وەڵام دا پێی ئەڵێن : ئێوە کەمتەرخەمی و کردوە لە کفن کردنەکەی ، کفنێکی جوان و بۆ نەکردوە بۆیە شەرمی کردوە لەگەڵ ئێمە بۆ ئێرە بێـت . ئنجا وتی : پیاوەکە چوە لای پێغەمبەر (ﷺ) و هەواڵی خەوەکەی دایە ، پێغەمبەریش (ﷺ) فەرمووی : «تەماشا بکەن بۆ دڵنیا بوون لەم ڕێگەیەوە» . دواتر پیاوەکە چوە لای ئەنصاریەك کە لەسەرەمەرگ دابو ، هەواڵی خەوەکەی پێدا ، ئەنصاریەکەش ووتی : ئەگەر هەر یەکێك بتوانێت بگاتە لای مردوان ئەوا من بۆ لایان ئە چم و سەردانیان ئەکەم و نیگەرانیەکەی تۆیان پێ ڕائەگەیەنم .

ئەوسا ئەڵێت : کاتێك ئەنصاریەکە ئەمرێت ، پیاوەکە دوو پارچە قوماشی بە زەعفەران چنراوی پێ ئەبێت و دێتە لای تەرمی ئەنصاریەکە ، لەکاتی ناشتنی تەرمەکەی ، لەگەڵی دا لەناو گۆڕەکەی دائەنێت "بەهیوای ئەوەی کەمتەرخەمی کردنەکەی لە ئاست خێزانەکەی دا ڕاست بکاتەوە" پاش ئەوەی کە شەو دا دێت لە خەونیدا هەمان کۆمەڵە ژن ئەبینێت ، بەڵام ئەمجارەیان خێزانەکەشی لەگەڵ ئەوان ئەبێت و دوو پارچە قوماشی زەردی پۆشیوە .

* * * * *

بەلاَم سەبارەت بە بيستني مردوەكان لەوتەي ئەوانەي كە زيندوون : ئەوە لە ﴿صەحيحي بوخاري و موسليم﴾دا هاتوە ، و لە "ئەنەس"ەوە ئەگێرێتەوە ، ئەويش لە "طلحە" ئەگێرێتەوە ، و ئەلێت : پاش سەركەوتن لە غەزاي بەدر ، پێغەمبەري خوا (ﷺ) فەرمان بە هاوەلاَن ئەكات كە تەرمي بيست و هەندێك لە گەورە بێباوەڕەكاني قورەيشە ، لە گێرانەوەيەك دا هاتوە ، كە بيست و چوار پياو بون لە گەورەكانيان ، كە كوژرابون ، "فەرمان بە هاوەلاَني ئەكات" كە ئەم كوژراوانە كۆبكەنەوە و فرێيان بدەنە ناو يەكێك لە چالاَكاني ناوچەي بەدر ، پاش جێبەجێ كردني فەرمانەكەي . پێغەمبەر (ﷺ) ئەچێتە سەر چالاَكە و بانگيان ئەكات و ئەفەرموێت : «ئەي ئەبو جەهل كوري هشام ، ئەي ئومەييەي كوري خەلەف ، ئەي عەتەبەي كوري رەبيعە ، ئەي شەيبەي كوري رەبيعە ، ئايا ئەو پەيمانەي كە خواي گەورە پێتاني دابوون ، پێتان گەيشت ؟ چونكە من ئەوەي خواي گەورە پەيماني پێدابوم ، پێمگەيشت» . عمر كوري خطابيش ئەلێت : ئەي پێغەمبەري خوا (ﷺ) چ سودي هەيە چونكە هەرگيز لاشەيەك قسەي نەكردوە كە گيانەكەي دەرچوبێت . ئەويش ئەفەرمووێت : «سوێند بە ئەو كەسەي كە گياني مني بەدەستە ئێوە لە ئەوان باشتر نابيستن ، كاتێك من ئەم قسانەيان پێ ئەلێم» . {بوخاري و موسليم گێراويتيانەوە} .

لە ﴿صەحيحي موسليم﴾دا هاتووە لە فەرموودەي ئەنەس بەهەمان شێوەي فەرموودەي پێشووە بەلاَم بێ باس كردني ئەبو طلحە ، وە لە فەرموودەكەش هاتووە كە ئەلێت : «سوێند بە ئەو كەسەي كە گياني مني بەدەستە ، ئێوە باشتر لە ئەوان نابيستن ، كاتێك من ئەم قسانەيان پێ ئەلێم ، تەنها ئەوە هەيە ئەوان ناتوانن وەلاَمي قسەكان بدەنەوە» . {موسليم گێراويتيەوە} .

ديسان لە ﴿صەحيحي بوخاري و موسليم﴾دا هاتوە ، كە لە كوڕي عمر (ﷺ) ئەگێرێتەوە ، و ئەلێت : پێغەمبەر (ﷺ) چوە سەر ئەوانەي ناو چالاَكە و پێيوتن : «ئايا پێتان گەيشت ئەوەي خواي گەورە پەيماني پێدابوون ؟» ئەوسا هاوەلێكيش پێيوت : ئايا بانگي مردوان ئەكەيت ؟ ئەويش فەرمووي : «ئێوە لە ئەوان باشتر نابيستن ، بەلاَم ئەوە هەيە ئەوان ناتوانن وەلاَم

بدەنەوە» . لە گێڕانەوەیەکی دیکەش دا هاتووە کە ئەڵێت : «ئەوان ئەتوانن ئێستا گوێیان لە قسەکانم بێت» . {بوخاری و موسلیم گێراویتیانەوە} .

عائیشە (خوا لێی رازی بێت) نکوڵی لەمە "واتە : لەتوانای مردوو بۆ بیستنی قسەی ئەوانەی کە زیندوون" ئەکات ، هەروەك لە ﴿صەحیحی بوخاری و موسلیم﴾ لە عوروە ئەگێڕێتەوە ، ئەویش لە عائیشە (خوا لێی رازی بێت) ئەگێڕێتەوە کە ئەڵێت : پێغەمبەر (ﷺ) ئەیوتوە : «ئەوان ئەتوانن ئێستا گوێیان لە قسەکانم بێت» . "ئیبن عمر" لێی تێك چوە . بەڵکو پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی : «ئەوان ئیستا تێئەگەن لەوەی من پێمئەوتن کە ڕاستە» ، پاشان ئەو ئایەتەی خوێندەوە کە خوای گەورە (ﷻ) ئەفەرمووێت : ﴿ إِنَّكَ لَا تُسْمِعُ ٱلْمَوْتَىٰ وَلَا تُسْمِعُ ٱلصُّمَّ ٱلدُّعَآءَ إِذَا وَلَّوْاْ مُدْبِرِينَ / واتە : بێگومان تۆ ناتوانیت ئەم بانگەوازە بخەیتە ناو دڵی مردوو کەڕ و لاڵەکانەوە ، بە تایبەت کاتێك ڕوو وەردەگێڕن و پشت هەڵدەکەن "بڕیاری داخستنی دڵ و گوێیان دەدەن" ﴾ ﴿ النمل: ٨٠ و الروم: ٥٢﴾ . هەروەها لە ئایەتێکی دیکەش ئەفەرموێت :﴿ ... وَمَآ أَنتَ بِمُسْمِعٍ مَّن فِى ٱلْقُبُورِ / واتە : ... بەڵام تۆ ئەی پێغەمبەر (ﷺ) ناتوانێت پەیامەکەت بگەیەنێت بەو کەسانەی کە لەناو گۆڕدان "مەبەست کافرانە کە وەك مردوو نابیستن و ئەگەر بشبیستن سوودی لێ وەناگرن" ﴾ ﴿فاگر: ٢٢﴾ .

هەندێك لە زانایانیش هاوڕان لەگەڵ وتەی عائیشە لە نکوڵی کردن لە بیستنی مردوو لە قسەی ئەوانەی کە زیندوون ، هەروەها قاضي ئەبو "یعلی"ش لە پەرتوکەکەی (الجامع الكبير) پەسەندی کردوە ، هەمان بەڵگەی عائیشەیان هێناوە ، بەهەمان شێوەش وەڵامی فەرموودەی ئەوانەی ناو چاڵی ناوچەی بەدر ئەداتەوە ، یاخود ئەڵێن ئەمە لەوانەیە تایبەت بێت بە پێغەمبەر (ﷺ) وەك موعجیزەیەك وابێت بۆی ، ئەویش بیستنی مردوە لە فەرمودەکانی .

لە ﴿صەحیحی بوخاری﴾دا هاتوە و ئەگێڕێتەوە لە قەتادە کە ئەڵێت : خوای گەورە وەك سزادانێك "خەڵکی ناو چاڵەکەی" زیندوو کردنەوە و توانای ئەوەی پێبەخشین کە بتوانن

گوێبیستی فەرموودەکانی پێغەمبەر (ﷺ)بن و زیاتر داخ و خەفەت هەڵکێشن بۆ ژیانی لە دەست چویان .

هەندێك لە زایان ڕایان لەسەر ئەوەیە کە بە شێوەیەکی گشتی مردوو توانای بیستنی هەیە ، لەمبارەیەوەش کوڕی عبدالبر ئەڵێت : زۆرێك لە زانایان لەناویان دا (طبری "مەبەست لێی کوری جەریرە") هەروەها کوری قوتەیبە و جگە لەویش ڕایان لەسەر ئەم توانایەی مردوان هەیە ، ئەمانە وەك لەپێش دا رابرد بەڵگە بە فەرموودەی "خەڵکی ناو چاڵەکە" ئەهێننەوە و ئەڵێن : ئەمە راستیە نەك وەهم لەوەی کە گێراویتیانەوە ، چونکە عمر و ئەبو طلحە لەکاتی ڕوداوەکە لەوێ بوون ، بەڵام عائشە لەوکاتەدا لەوێ نەبوە ، هەروەها گێرانەوەی عائشەش کە ئەڵێت : پێغەمبەر (ﷺ) ئەفەرموێت : «ئێستا ئەوان ئەزانن کە ئەوەی پێمنە وتن ڕاستە» ، پاڵپشتی گێرانەوەی ئەوانە ئەکات : کە ئەڵێن «ئەوان ئەبیستن» هیچ دژایەتیەك لەنێوان دوو گێرانەوەکە نیە ، چونکە کاتێك مردوو توانای ئەوەی هەبێت کە بزانێت ئەشتوانێت ببیستێت ، لەبەر ئەوەی مردن پێچەوانەی زانست و زانیاریە ، هەروەك پێچەوانەی بیستن و بینینیشە ، چونکە ئەگەر لە هەندێك توانا قەدەغە بکرێن ، ئەوە ئەبێت لە هەموان قەدەغە بکرێن نەك لەهەندێکی .

ئەبو شیخ ئەصبەهانی بەسەنەدەوە لە عوبەید کوڕی مزروق ئەگێڕێتەوە ، و ئەڵێت : لەشاری مەدینە ئافرەتێك بەناوی "دایکی محجن" هەبو خزمەتی مزگەوتی ئەکرت ، کاتێك کۆچی دوایی کرد ، پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئاگادار نەبو ، ئینجا کاتێك بەنزیك گۆڕەکەیدا ئەڕوات بە هاوەڵەکانی ئەڵێت : «ئەم گۆڕە تازە هی کێیە؟» ئەوانیش وتیان : گۆڕی "دایکی محجن"ە . بۆیە پێغەمبەریش (ﷺ) فەرمووی : «ئەوەی لە مزگەت دا ئەمایەوە و خزمەتی ئەکرد؟» ئەوانیش وتیان : بەڵێ . پاشان پێغەمبەر (ﷺ) خەڵکەکەی کردنە ڕیز و نوێژی مردویان لەسەر کرد ، ئەوسا ڕووی کردە گۆڕەکە و پێی فەرموو : «ئایا کامە کردەوە بۆتۆ لە هەموو کردەوەکانت ئەنجامیان باشتر بوو؟» هاوەڵەکانی وتیان : ئەی پێغەمبەری خوا ئایا گوێی لێ ئەبێت ؟ ئەویش فەرموی : «ئێوە لەو باشتر گوێ بیستی وتەکانم نابن» ، ئینجا باس ئەکات لەوەی کە وەڵامی داوەتەوە و





رتویەتی : خزمەتی مزگەوت لە هەمویان باشتر بوە . (ئەم فەرمودەیە "مرسل" ە) {سەیری پەرتووکی "الترغیب و الترهیب"بکە} .

بەلاَم سەبارەت بەوەی کە ئەلێن ئەمە "واتە بیستنی مردوەکان لە وتەی پێغەمبەر" تایبەتە بە پێغەمبەر (ﷺ) ، لە ڕاستیدا ئەمە وانیە ، چونکە لە ﴿صەحیحی بوخاری و موسلیم﴾دا هاتوە لە ئەنەس ئەگێڕێتەوە ، ئەویش لە پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەگێڕێتەوە کە ئەفەرموێت : «کاتێك بەندە ئەمرێت و ئەیخەنە ناو گۆڕ و هاوەڵەکانی پشتی تێ ئەکەن و هەریەکە ئەچێتەوە ماڵی خۆی ، ئەو "واتە: مردوەکە" گوێی لە دەنگی پێڵاوەکانی ئەوانەیە کاتێك بەڕێدا ئەڕۆن» . {بوخاری و موسلیم گێراویتیانەوە} . هەروەك لەپێش دا باسمان کردوە ، "دواتریش بە یارمەتی خوا" باسی ئەو فەرموودانە ئەکەین کە لەبارەی گوێ بیستی مردوان لە سەلامی ئەوانەی کە سەلامیان لێ ئەکەن .

سەبارەت بە فەرمودەی خوای گەورە کە ئەفەرموێت :﴿ إِنَّكَ لَا تُسْمِعُ الْمَوْتَىٰ .../ واتە: بێگومان تۆ ناتوانیت ئەم بانگەوازە بخەیتە ناو دڵی مردوو... ﴾ ﴿النمل: ٨٠﴾ . هەروەها ئەو ئایەتەی کە ئەفەرموێت : ﴿ ...وَمَا أَنتَ بِمُسْمِعٍ مَّن فِي الْقُبُورِ / واتە : ... بەلاَم تۆ ئەی پێغەمبەر (ﷺ) ناتوانیت پەیامەکەت بگەیەنیت بەو کەسانەی کە لەناو گۆڕدان "مەبەست کافرانە کە وەك مردوو نابیستن و ئەگەر بشبیستن سوودی لێ وەرناگرن" ﴾﴿ فاگر: ٢٢﴾ .

بەشێوەکی گشتی مەبەست لە بیستن : زانین و تێگەیشتنی وتەیە ، هەروەها بە واتای سوود لێ وەرگرتن و وەلاَم دانەوەش دێت . بەلاَم لەنێو ئەم ئایەتانە مەبەست تەنها سوود لێ وەرگرتن و وەلاَم دانەوەیە . چونکە ئەم گوتارە ڕووەو ئەو بێباوەڕانەیە کە ناچنە سەر ڕێگەی ڕاست و باوەڕ ناهێنن ، هەروەك خوای گەورە ئەفەرموێت : ﴿ وَلَقَدْ ذَرَأْنَا لِجَهَنَّمَ كَثِيرًا مِّنَ الْجِنِّ وَالْإِنسِ ۖ لَهُمْ قُلُوبٌ لَّا يَفْقَهُونَ بِهَا وَلَهُمْ أَعْيُنٌ لَّا يُبْصِرُونَ بِهَا وَلَهُمْ آذَانٌ لَّا يَسْمَعُونَ بِهَا ... / واتە: سوێند بە خوا بێگومان ئێمە زۆر لە پەری و ئادەمیزادمان بۆ دۆزەخ دروست کردوە ، ئەوانە دەزگای دڵیان

هەیە و کەچی حەقی پێ تێناگەن ، چاویشیان هەیە کەچی حەقی پێ نابینن، گوێیان هەیە کەچی حەقی پێ نابیستن ... ﴾ ﴿الأعراف: ١٧٩﴾ .

لەم ئایەتەدا باسی ئەوە ئەکات کە ئەوانە نابیستن و نابینن ، چونکە هەندێك جار نکوولّی لە شتێك ئەکرێت لەبەر ئەوەی هیچ سوود و قازانجی نیە ، بۆیە ئەگەر هاتوو مرۆڤ سوود و قازانجی وەرنەگرت لەوەی کە ئەیبیستێت و ئەیبینێت ، وەکو ئەوە وایە گوێی لێ نەبوبێت ، هەروەها نەشی بیستبێت ، بەهەمان شێوە بیستنی مردوانیش بەجۆرەیە . هەروەها بیستنی بێباوەڕانیش لەشێوەی ئەمەیە بەرامبەر بە کەسێك کە بۆ سەر ڕێگەی راست و باوەڕهێنان بانگیان بکات بەلاّم ئەوان وەلاّم نەدەنەوە .

سەبارەت بە وتەی قەتادە کە لە بارەی "خەلکی ناو چالّەکە" ئەلّێت : لەو کاتەدا خوای گەورە زیندووی کردنەوە تاوەکو وتەکانی پێغەمبەر (ﷺ) ببیستن ، ئەمە وتەیە بەلگەیە لەسەر ئەوەی کە مردوو لەنێو گۆڕەکەیدا تاوەکو خوای گەورە گیانی بۆ ناو لاشەکەی نەگەڕێنێتەوە هیچ نابیستێت ، بەهەمان شێوە زۆرێك لە زانایانی پێشین رایان وایە کە پرسیار لە مردوو ناکرێت تاوەکو گیانی بۆ ناو لاشەکەی نەگەڕێننەوە ، هەروەك ئەمە بە ڕاشکاوی لە فەرموودەیەکی درێژ دا هاتوە کە بەراء کوڕی عازب لە پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەگێڕێتەوە و لەپێش ئێستادا باسمان کردوە ، تیایدا لەبارەی بێباوەڕ هاتوە : «گیانی بۆ ناو لاشەکەی ئەگەڕێننەوە» .

هەروەها لە فەرموودەی کوڕی (مەندە) هاتوە ، لە گێڕانەوەی یونس کوڕی خەباب ، ئەویش لە منهال ئەگێڕێتەوە "لەپێش دا بەدرێژی باس کراوە" : بێباوەڕ گیانی بۆ ئەگەڕێتەوە کاتێك فریشتەی سزادان ئەیەوێت لێی بدات ، پاشانیش کە لێدانێکی بەهێزی لێ ئەدات لاشەکەی ئەبێتەوە خۆلّ ، ئەمە بەردەوام ئەبێت تاوەکو رۆژی زیندوو بونەوە .

ئیبن ماجە و جگە لەویش دەریانهێناوە لە فەرموودەی ئەبو هورەیرە (ﷺ) لە بابەت باسکردنی مردن و گیانکێشان ، لەبارەی گیانی بێباوەر ئەفەرموێت : «دواتر بۆناو گۆڕ ئەگەڕێتەوە» "ئەمە لەپێش دا باس کراوە" .





(خەلال) لە پەرتووكى «شرح السنە» لە ڕێگای باوكی هاشم دەریهێناوە و ئەڵێت : بڕوادار كاتێك كۆچی دوایی ئەكات و ئەمرێت ، فریشتەی گیانكێشان دێتە لای و بانگی ئەكات : ئەی گیانی پاك و بێگەرد لەناو لاشەی پاك دا وەرە دەرەوە ، دوای ئەوەی كە لەناو لاشەكەی دێتە دەرەوە لەناو قوماشێكی سوردا ئەیپێچن ، كاتێكیش خەڵكەكە ئەیشۆن و كفنی ئەكەن ، پاشان بەرەو گۆڕستانی ئەبەن گیانەكەی لە چواردەوری لاشەكەیەتی ، هەروەها لەوكاتەش كە لەناو گۆڕدا ئەینێژن ، گیانەكەی بۆ ئەگەڕێننەوە و فریشتەی لێپرسینەوەش دێتە لای و داینەنیشێنن و پرسیاری لێ ئەكەن : كێ پەروەردگارتە ؟ ئایینت كامەیە ؟ هەروەها پێغەمبەرت كێیە ؟ ئینجا ئەویش وەڵام ئەداتەوە و ئەڵێت : (الله) پەروەردگارمە ، ئایینم ئیسلامە ، محمدیش (ﷺ) پێغەمبەرمە . ئەوانیش پێی ئەڵێن : ڕاستت وت ، لە ئەنجامی ئەم وەڵامە باشانەی بە ئەندازەی بینینی چاوەكان گۆڕەكەی بۆ فراوان ئەكەن ، پاشان گیانەكەی بەرەو (أعلى عليين) لە ئاسمان لەو شوێنەی خوای گەورە بۆی دیاری كردوون بەرز ئەكرێتەوە، دوایی عبدالله ئەم ئایەتەی خوێندەوە كە خوای گەورە ئەفەرموێت : ﴿...إِنَّ كِتَٰبَ ٱلۡأَبۡرَارِ لَفِي عِلِّيِّينَ /... واتە : دەستەی سەرفرازان دوورن لەو تەنگانەیە ، بەڵكو نامەی كردەوەكانیان ، دۆسیەی ڕەفتاریان وا لە شوێنە بەرزو بڵندەكاندایە ﴾ المطففين: ١٨﴾ .

ئیبن ئەبو دنیا لەڕێگەی سالم كوڕی ئەبو جەعد دەریهێناوە و ئەڵێت : حذيفە وتی : كاتێك مرۆڤ ئەمرێت گیانەكەی ئەكەوێتە دەست فریشتە و لاشەكەش لەبەر دەست مرۆڤەكان دایە و ئەیشۆن ، كاتێكیش بەرەو گۆڕستان ئەیبەن ئەو فریشتەیەی كە گیانەكەی پێیە لەگەڵیان ئەچێتە سەر گۆڕستان ، پاش ئەوەی خرایە ناو گۆڕ و ناشتیان ، گیانەكەی بۆ ئەگەڕێننەوە و لەو كاتەش لێپرسینەوەی لەگەڵ دا ئەكرێت .

لەڕێگەی عبدالرحمن كوڕی ئەبو زناد ، ئەویش لەڕێگەی عبدالرحمن كوڕی ئەبو لیلی ، ئەڵێت : لەوكاتەدا گیانەكە وابەدەست فریشتەكەوە ، لەگەڵ تەرمەكە بەرەو گۆڕستان ئەڕوات و

پێی ئەڵێت گوێ بگرە لەوەی پرسیارت لێ ئەکەن ، کاتێکیش لاشەکەی ئەخرێتە ناو گۆڕ گیانەکەی بۆ ئەگەڕێننەوە .

هەروەها لەرێگەی داود (العطار)ەوە ، ئەویش لە باوکی (نوجەیح)ەوە ، ئەگێڕێتەوە و ئەڵێت : هەر مرۆڤێك لەوکاتەی کە ئەمرێت ئەوا گیانەکەی وا لەدەست فریشتەیەکە ، ئامادەی شوشتنی لاشەکەی ئەبێت و سەیری ئەکات تاوەکو بزانێت چۆن لاشەکەی ئەشۆن و کفنی ئەکەن ، چۆن بەرەو گۆڕستانی ئەبەن ، پاشان لەناو گۆڕدا گیانەکەی بۆ ناو لاشەکەی ئەگەڕێننەوە ، دوایی بۆ پرسیار لێکردنی ئامادەی ئەکەن و داینەنیشێنن .

بەهەمان شێوە باوکی صالح و جگە لەو لە زانایانی پێشین هەمان رایان هەیە لەبارەی راڤەکردنی ئەم ئایەتەی خوای گەورە کاتێك ئەفەرمووێت : ﴿ كَيْفَ تَكْفُرُونَ بِاللَّهِ وَكُنتُمْ أَمْوَاتًا فَأَحْيَاكُمْ ثُمَّ يُمِيتُكُمْ ثُمَّ يُحْيِيكُمْ ثُمَّ إِلَيْهِ تُرْجَعُونَ / واتە : (خەڵکینە) ، چۆن بێ بڕوا دەبن بەخوا لە کاتێکدا ئێوە بێ گیان بوون (لەتوێی خاکدا) خوا (دروستی کردوون) و گیانی بەبەردا کردن ، پاشان دەتانمرێنێت و دوایی زیندووتان دەکاتەوە ، ئەوسا هەر بۆ لای ئەویش دەگەڕێنەوە ﴾ ﴿البقرة: ٢٨﴾ .

ئەمە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە ژیانی یەکەم مەبەست لێی ژیانی ناو گۆڕە بۆ لێپرسینەوە لێی . هەرچەندە زۆربەی زانایان رایان لەسەر ئەم شێوە راڤەکردنە نیە .

هەموو زانایانی پێشین بەراشکاوی ئەڵێن : مرۆڤ لەکاتی پرسیار لێکردنی لەلایەن فریشتەی پرسیارکەرەوە گیانی بۆ ئەگەڕێننەوە، بەهەمان شێوە هەندێك لە شەرعزانەکان و زانایانی (المتكملين) لە هاوەڵ و هاودەمی ئیمە و جگە لەوانیش , وەکو قاضی ئەبو (یەعلا) و هاوەڵەکانی ئەم رایەیان هەیە ، هەندێك لەزانایانیش لەوانە ئیبن حەزم و جگە لەویش نکوولی لەمە ئەکەن ، باس ئەکەن لەوەی کە پرسیار کردن لە گیانی مرۆڤ و بیستنی قسەی زیندوان شێوەیەکی تایبەتیە ، هەروەها نکولی لەوە ئەکەن لەناو گۆڕ دا گیانی مرۆڤ بگەڕێنرێتەوە ناو لاشەکەی ئایا بۆ سزادان بێت یاخود بۆ خۆشی بەسەردا رژاندنی بێت . لەم بارەیەوە ئەڵێن : ئەگەر

ئەمە ڕاستبوایە ، دەبو سێ جاران مرۆڤ بمردبایە و زیندوو کراباوە ، قورئانیش تەنها باسی دوو مردن و دوو زیندووبونەوەی کردوە . لە ڕاستیدا ئەمە ڕایەکی زۆر لاوازە ، چونکە ژیانی ناو بەند "بەرزەخ" ژیانێکی تەواو و سەربەخۆ و ئازاد نیە وەکو ژیانی "ئێستای" دنیا ، و ژیانی دوارۆژ "واتە ژیانی پاش زیندووبونەوە" ، بەڵکو ئەمە ژیانێکی تایبەتیە و جۆرێکە لە هەبوونی پەیوەندی گیان بە لاشەکەی خۆیەوە ، بەشێوەیەکە ، کە لاشەکە هەست بە خۆشی "نیعمەت" و سزادان و جگە لەمانە نەکات ، هەروەها ئەمە ژیانێکی تەواو نیە تاوەکو جیابوونەوەی گیان لە لاشەکەی مردنێکی تەواوی وەکو "ئەو مردنەی ئێمە ئەیبینین" بێت ، بەڵکو وەکو جیابوونەوەی گیانی نوستوە لێی کاتێك ئەخەوێت ، و پاشان بۆی ئەگەڕێتەوە ، لەبەر ئەم وێکچوونە بە ژیان و مردن ئەوترێت : "ئەمە ژیان و مردنی لەناو گۆڕدا هەیە" .

هەروەك کاتێك پێغەمبەر (ﷺ) لە خەو هەڵئەستا ئەیفەرموو : «سوپاس و ستایش بۆ ئەو خوایەی کە دوای مردنمان زیندووی کردینەوە و هەر بۆ لای ئەویش ئەگەڕێینەوە» .{بوخاری گێراویەتیەوە} .

خوای گەورە خەوتنی بە مردن ناوبردوە ، هەروەك لەم ئایەتەی قورئان دا بەڕوونی و ئاشکرایی بەدی ئەکرێت : ﴿ ٱللَّهُ يَتَوَفَّى ٱلْأَنفُسَ حِينَ مَوْتِهَا وَٱلَّتِي لَمْ تَمُتْ فِي مَنَامِهَا ۖ فَيُمْسِكُ ٱلَّتِي قَضَىٰ عَلَيْهَا ٱلْمَوْتَ وَيُرْسِلُ ٱلْأُخْرَىٰٓ ... / واتە : هەر خوایە کە گیانەکان دەکێشێت لەکاتی مردنیاندا ، هەروەها ئەو گیانەش کە نەمرد لە خەوەکەیدا هەر خوا بۆی دەنێرێتەوە ، جا ئەو کەسەی کە خوا بڕیاری مردنی دابێت ڕۆحەکەی دەگەڕێتەوە و ناچێتەوە بۆ لاشەی ، ئەو کەسەش کە ڕۆژی تەواو نەبوبێت دەینێرێتەوە بۆی ... ﴾ ﴿ الزمر: ٤٢﴾ .

لەگەڵ ئەوەی کە دژایەتی و پێچەوانە نیە لەوەی کە نوستوو زیندووبێت ، بەهەمان شێوە پەیوەندی هەبوونی نێوان گیان و لاشە لەنێو گۆڕدا و جیا بونەوەشی لێی لەوێدا ئەوە نیە کە ژیانێکی سەربەست و تەواوی وەکو ژیانی ئێستای دنیای هەبێت .

هەروەها لەو زانا هاوەڵ و هاوەدەمانەی کە ئەم ڕایەیان "واتە : لێپرسینەوە و خۆشی و ناخۆشیەکانی گیان لەناو گۆڕدا" بە پەسەند داناوە ئیبن عوقەیل و ئەبو فەرەج (ابن الجوزی) لە هەندێك لە پەرتووکەکانی دا باسیان لێوە کردوە ، ئیبن عوقەیل بەڵگە ئەهێنێتەوە و لەمبارەیەوە ئەڵێت : "گیانی بڕواداران وا لەناو باڵندەیەکی سەوز لەناو بەهەشت خۆشی لەو نازو نیعمەتانە ئەبینن کە خوای گەورە پێی بەخشیون ، هەروەها گیانی بێباوەڕانیش لەناو باڵندەیەکی ڕەش ئەو سزایە وەرئەگرن کە خوای گەورە بۆی ئامادە کردوون ، ئەم لاشانەی ئێستا هەیە لەناو ئەچێت ، ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی "گیان" لەناو لاشەیەکی دیکە خۆشی یان سزا وەرئەگرێت . لە ڕاستیدا ئەمە پێویست بە بەڵگەهێنانەوە ناکات چونکە ئەم جۆرە خۆشی وەرگرتنەی "گیان" یان سزاوەرگرتنەکەی دژایەتی و پێچەوانە نیە لەگەڵ دروست کردنی پەیوەندی لەهەندێك باردا بە لاشە بنەڕتیەکەی خۆی ، لەهەمان کاتیشدا بمێنێتەوە لەسەر ئەم شێوە بارودۆخەی ئێستا کە تێیدایەتی .

هەندێك لەو زانایانەی لەسەر ئەم ڕایەن بەڵگەیان بە ئەم گێڕانەوەی منصور کوڕی عبدالرحمن هێناوەتەوە ئەویش لە ئەبو ئومامە ئەگێڕێتەوە و ئەڵێت : لەوکاتەی کوری زبیریان شەهید کردبوو ، پاشان بە داریشیان هەڵواسی بوو ، ئنیجا پاش ئەوەی کەسە نزیکەکانی لاشەکەی ڕزگار ئەکەن و ئەیهێننەوە ناو مزگەوت ، کوڕی عمر سەردانی مزگەوت ئەکات ، ئامادەبوانیش پێی ئەڵێن : ئەمە ئەسمانی کچی ئەبوبەکرە وا لەوێیە ، ئەوسا کوری عمریش ئەچێتە لای و دڵی ئەداتەوە و پێی ئەڵێت : ئارام بگرە چونکە لاشە لە بنچینەدا هیچ بایەخێکی ئەتۆی نیە ، بەڵکو ئەوەی گرنگە گیانەکەیەتی ئەویش ئێستا وا لەلای خوای گەورەیە . ئەسمائیش لەوەڵامدا وتی : چ شتێك ڕێی ئارام گرتنم لێ ئەگرێت ، لەبەر ئەوەی کاتێك زەکەریا پێغەمبەر (عليه السلام) شەهید کرا سەریان لە لاشەی جیا کردەوە و کردیانە هەدیە بۆ یەکێك لە داوێن پیسەکانی بەنی ئیسرائیل .

ئیبن ئەبو دنیا لە ڕێگەی ئیبن عمر "صاحب السقیا" ئەگێڕێتەوە و ئەڵێت : جارێکیان کوڕی عمر ئەچێتە گۆڕستان و لەوێ ماوەیەك سەرنج ئەدات ، لەم سەرنج دانەی گۆڕێك ئەبینێت

کە تێك چوە و کەللە سەری ئەو کەسەی کە لەناو ئەو گۆڕەیان بەخاك سپاردوە وا بەدەرەوەیە ، کوڕی عمریش بەیەکێك لەو کەسانەی لەگەڵی دایە ئەڵێت : ئەم کەللە سەرە بە خاك بسپێرەوە ، پاش ئەوەی ئەیشارنەوە ، ئەڵێت : ئەم خاکە ناتوانێت هیچ زیان و ئازارێك بە ئەم لاشانە بگەیێنێت ، بەڵکو ئەوەی سزا یان خۆشی وەرئەگرێت تاوەکو ڕۆژی زیندووبونەوە تەنها گیانەکەیە .

محمد کوڕی سەعد لە واقدی ئەگێرێتەوە و ئەڵێت : (ثور) کوری یەزید لە خالد کوری (معدان) ئەگێرێتەوە , ئەڵێت : کاتێك ڕۆمەکان لە غەزای (ئەجنادین) ئەشکێن و ڕائەکەن ئەگەنە شوێنێك چاڵیەکی لێیە تەنها مرۆڤ ئەتوانێت پێیدابڕوات ، بۆیە ڕۆمەکان لەویٚ ئەوەستن و جەنگێکی باش ئەکەن ، لە وەڵامی ئەمەش دا هشامی کوری عاص پێش ئەکەوێت و لەگەڵیان ئەجەنگێت تاوەکو شەهید ئەکرێت و ئەکەوێتە ناو چاڵەکە و پڕی ئەکاتەوە ، کاتێك موسڵمانەکان ئەگەنە ئەویٚ هیچ ڕێگەیەك نیە پێیدا بڕۆن تەنها بەسەر ڕۆیشتنی نەبێت بۆیە ئەوەستن ، چونکە پێیان ناخۆش ئەبێت بەسەریدا بڕۆن ، لەهەمان کاتیشدا ڕێگە چارەشیان نیە، بۆیە بەنیاز بوون لاشەکەی لەناو چاڵەکە بهێننە دەرەوە ، لەوکاتەش عەمر کوری عاص ئەبینیٚ و پێیان ئەڵێت : ئێستا ئەمە شەهید بوە و خوای گەورە پێی ئاگادارە و گیانەکەی بۆ لای خۆی بەرز کردۆتەوە ، ئەوەی ماوە تەنها لاشەیەکە بۆیە بەسەریدا بڕۆن ، ئەوسا بەسەریدا ئەڕوات و خەڵکەکەش بە شوێنیدا دێن ..

ئەم شوێنەوار و ڕووداوانە بەڵگە نین لەسەر ئەوەی دوای مردنی مرۆڤ گیانەکەی پەیوەندی بەلاشەکەیەوە ناکات ، بەڵکو ئەمە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە لاشە بەشدار نیە لە وەرگرتنی خۆشی یان سزای ناو گۆڕ ، یاخود زیانی پێناگانات لەوەی کاتێك خاك و خۆڵ لاشەکە ئەخوات و ئەیکاتەوە بەخۆڵ ، بەڵکو ئەم خۆشی وەرگرتنە یان سزا چەشتنە هاوشێوەی سزا و خۆشی دنیا نیە ، و جۆرێکی دیکەیە لەمانە ، و بە مۆڵەت و توانای خوای گەورە ئەگاتە مردوو .

بەڵام سەبارەت بەو ڕایەی ئەوان کاتێك ئەڵێن : گیانەکان لەلایەن خوای گەورەن و خۆشی یاخود سزا وەرئەگرن ، ئەمە دژایەتی نیە لەگەڵ ئەوەی هەندێك ئەم خۆشیە یان ناخۆشیە بە لاشەش بگات ، لەمەوە لاشەکە خۆشی یان سزا وەرئەگرێت ، هەندێك جاریش گیانەکەی بە تەنها

و بێ ئەوەی لاشە بەشداربێت خۆشی یان سزا وەرئەگرێت ، ئەمە یەکسانە لەو کاتەدا بێت کە بۆ ناو لاشە گەڕابێتەوە ، یاخود پێش ئەو کاتەوە بێت .

سەبارەت بەزانین و ئاگادار بوونی مردوو بە ئەو کەسانەی کاتێك سەردانی ئەکەن و سەلامی لێ ئەکەن ، ئەوا محمد کوری (أشعث) ئەگێڕێتەوە ، ئەویش لە باوکی سەلەمە ، ئەویش لە ئەبو هورەیرە ئەگێڕێتەوە و ئەڵێت : ئەبو رزین وتی : ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) کاتێك هاتوو چۆ ئەکەم رێگاکەم بەسەر گۆڕستانە ئایا هیچ وتەیەك هەیە بیڵێم کاتێك بەلایان دا ئەڕۆم ؟ پێغەمبەریش (ﷺ) فەرمووی : «بڵێ : سەلامتان لێبێت ئەی خەڵکانی موسڵمانی ناو گۆڕستان ، ئێوە پێش ئێمە کەوتن ، ئێمەش بەدوای ئێوەدا دێین ، بە یارمەتی خوا ئێمەش دێینە لای ئێوە» ئەبو (رزین) وتی : ئەی پێغەمبەری خوا ئایا ئەوان وتەکانم ئەبیستن ؟ ئەویش فەرمووی (ﷺ) : «بەڵێ ئەبیستن ، بەڵام ناتوانن وەڵامت بدەنەوە» .

لە ﴿صەحیحی موسلیم﴾ دا هاتوە و لە عبدالرحمن کوڕی شەماسەی مەهری ئەگێڕێتەوە ، کاتێك عەمری کوری عاص ئەگاتە سەرەمەگ ، وەسیەت ئەکات و تیایدا ئەڵێت : پاش ئەوەی لەناو خاك دا ئەمنێژن خاکم بەسەردا ئەکەن ، ماوەیەك لەسەر گۆرەکەم بمێننەوە ، هەتاوەکو بە تەنها نەمێنم و بزانم فریشتەکانی خوای گەورە چ پرسیارێکم لێ ئەکەن . {موسلیم گێراویتیەوە}

❊ ❊ ❊

## وچانێك

لە پێش دا باسی قسەکردنی مردوو و وەڵامدانەوەی ئەو کەسانەی کە سەلامیان لێ ئەکەن بەدرێژی باسم کردوون ، ئەمە دژایەتی ئەم فەرمودەیەی پێغەمبەر نیە (ﷺ) کە ئەفەرموێت : «ناتوانن وەڵام بدەنەوە» چونکە مەبەست لە وەڵام دانەوەی ئەوان ، ئەو وەڵامدانەوەیە کە ئێمە پێی ئاشناین و گوێ بیستی ئەبین . لەبەر ئەوەی بە بەڵگەوە قسەکردنی مردوان لەگەڵ یەکتری سەلماوە .

هەروەك لە ﴿صەحیحی بوخاری﴾دا هاتوە و لە سعید خودری (ﷺ) ئەگێرێتەوە ، ئەویش لە پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەگێرێتەوە کە ئەفەرموێت : «کاتێك تەرمی مردوو ئەشۆردرێت و لەسەر شان دایئەنێن و بەرەو گۆڕستان ئەیبەن، ئەوسا ئەگەر خواپەرست بوبێت ئەوا ئەڵێت : خێراکەن . خۆ ئەگەر لە خوا بێ ئاگا بوبێت ئەوا ئەڵێت : ناخۆشی بۆ خۆم بۆ کوێم ئەبەن . لەو کاتەدا هەموو بونەوەرێك ئەم دەنگەی ئەبیستێت ، تەنها مرۆڤ نەبێت ، چونکە ئەگەر هاتوو بیبیستێت یەکسەر گیانی دەرئەچێت» . {بوخاری گێراویەتیەوە} .

هەروەها لە پێش دا باسی فەرموودەی ئەنەس و جگە لەومان کردوە ، تیایدا هاتوە : «مردوو کاتێك لەناو گۆڕەکەی سزا ئەدرێت بە هۆی لێدانی بە پارچە ئاسنێکی بەهێز ، هاوارێکی زۆر گەورە ئەکات هەموو بونەوەرێك ئەیبیستیت تەنها مرۆڤ و جنۆکە نەبێت» . {ئەبو داود گێراویتیەوە} .

❊ ❊ ❊

سەبارەت بە پێغەمبەران (سەلامی خوایان لێبێت) ئەوا هیچ گومان نیە لەوەی كە گیانەكانیان وا لەلای خوای گەورە لە ﴿أعلى عليّين﴾ .

لـە ﴿صەحیحی موسلیم﴾ دا هـاتوە كـە دوایین وتـەی نزای پێغەمبەر (ﷺ) لە سەرەمەرگ دا فەرمووی : «اللهم الرفيق الاعلى» . {بوخاری گێراویتیەوە} . هەتاوەكو كۆچی دوایی كرد هەر دووبارەی ئەكردەوە .

جارێكیان پیاوێك پرسیاری لە كوڕی مەسعود كرد و وتی : پێغەمبەر (ﷺ) كۆچی دوایی كرد گیانی كێشرا ، بەڵام ئەی ئێستا گیانەكەی لە كوێیە؟ ئەویش لە وەڵامدا وتی : لەناو بەهەشت دایە .

بەڵام سەبارەت بە ئەو كەسانەی كە لە پێناو ڕێگای خوادا شەهید بوون ئەوا زۆربـەی زانایان ڕایان لەسەر ئەوەیە كە گیانەكانیان لەناو بەهەشت دایە . فەرموودەی زۆریش لەمبارەیەوە گێردراونەتەوە .

لـە ﴿صەحیحی موسلیم﴾ دا لە مـەسروق ئـەگـێڕێتەوە ، كـە ئەڵـێت : جـارێكیـان لە بـارەی ئـەم ئایەتـەوە كـە خـوای گـەورە ئەفەرمـوێت :﴿ وَلَا تَحْسَبَنَّ ٱلَّذِينَ قُتِلُوا۟ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ أَمْوَٰتًۢا ۚ بَلْ أَحْيَآءٌ عِندَ رَبِّهِمْ يُرْزَقُونَ \ واتە : هەرگیز وامـەزانن و وادامـەنێن ئـەوانـەی لەپێنـاوی خـوادا شـەهیـد بوون و كوژران ، مردوون ، نـەخێر وانیـە ، ئـەوانـە زیندوون ، لای پەروەردگاریان لە رزق و رۆزیی "هەمە جۆر و تایبەت" بەهرەوەرن ﴾ ﴿ئاڵ عمران: ١٦٩﴾ .

پرسیارمان لە كوڕی مەسعود (ﷺ)كرد ، لە وەڵام دا وتی : ئێمەش لە بارەی ئەم ئایەتەوە پرسیارمان لە پێغەمبەری خوا (ﷺ) كرد ئەویش لە وەڵام دا فەرمووی: «گیانەكانیان وا لەناو باڵندەیەكی سەوزە ، شوێنی هێلانەكانیان بە عەرش دا هەڵواسراون ، هەركاتێك حەزبكەن گەشتێك بەناو خۆشیەكانی بەهەشت دا ئەكەن ، بۆ مانەوەشیان ئەگەڕێنەوە هێلانەكانیان ، دواتر خوای گەورە لێیان ئەپرسێت ئایا هیچ شتێكی دیكەیان ئەوێت یاننا ؟ ئەوانیش ئەڵێن : حەز لە چ

شتێك بکەین لەکاتێك دا ئێمە بە ئازادی و سەربەستی بەناو بەهەشت دا گوزەر ئەکەین ، خوای گەورەش تاوەکو سێ جاران ئەم پرسیارەیان لێ دووبارە ئەکاتەوە ، ئەوانیش پاش ئەوەی کە ئەزانن هیچ ئاواتێکیان نەماوە بۆیان نەیەتە جێ ، داوا لە خوای گەورە ئەکەن و ئەڵێن : ئەی پەروەردگار گیانەکانمان بگەڕێنەوە ناو لاشەکانمان هەتاوەکو جارێکی دیکە لە پێناو تۆ دا بجەنگێین ، پاش ئەوەی کە ئەوان هیچ پێویستی تریان نەماوە وازیان لێ ئەهێنن » . {موسلیم گێراویەتیەوە} .

پێشەوا ئەحمەد و ئەبو داود و حاکم ، لە فەرموودەی سەعید کوری جوبەیر ئەگێرنەوە ، ئەویش لە ئیبن عباس (رەزای خوایان لێبێت) ئەگێرنەوە ، کە ئەڵێت : پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی : «دوای ئەوەی لە غەزای ئوحود هەندێك لە براکانتان و شەهید ئەبن ، خوای گەورە گیانەکانیان لە بەهەشت دا ئەخاتە ناو باڵندەیەکی سەوز و لەوێ لە ئاوی بەهەشت ئەخۆنەوە پاشان لە بەروبوومی دارەکان ئەخۆن و چێژ وەرئەگرن ، شوێنێکی لە زێڕیان بۆ پشوودان لە ژێر سێبەری عەرش بۆ دروست کراوە ، هەرچی حەز بکەن لەناو بەهەشت دا لێیەتی ، دای ئەوەی بۆیان دەرئەکەوێت کە لە هیچ شتێکیان کەم نیە ، ئەڵێن : ئایا کێ هەیە بە براکانمان رابگەیەنێت کە ئێمە لەناو بەهەشتدا زیندووین ، ئەخۆین و ئەخۆینەوە و هەرچی حەز بکەین لێیەتی ، هەتاوەکو لە غەزا کردندا دڵسارد نەبن و واز نەهێنن . لە وەڵامی داواکەی ئەوان خوای گەورە ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوە کە ئەفەرموویت : ﴿ وَلَا تَحْسَبَنَّ ٱلَّذِينَ قُتِلُوا۟ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ أَمْوَٰتًۢا ۚ بَلْ أَحْيَآءٌ عِندَ رَبِّهِمْ يُرْزَقُونَ ﴾ ﴿ آل عمران: ١٦٩﴾ . {ئەحمەد و حاکم گێراویەتیانەوە ، بە صەحیحی داناوە ، "ذەهەبی" ش هاوڕایە لەگەڵیدا} .

هەروەها لە شێوەی دەقی ئەم فەرمودەیەش ، ئەمەیە کە لە هەردوو پەرتووکی ﴿بوخاری و موسلیم﴾ ئەم فەرموودەیە تۆمار کراوە ، جابر ئەگێرێتەوە و ئەڵێت : لە کاتی غەزای ئوحود پیاوێك هاتە لای پێغەمبەر (ﷺ) ، کە هەندێك دەنکە خورمای بەدەستەوە بوو ، ئینجا وتی : ئەی پێغەمبەری خوا ئەگەر بکوژرێم بۆ چ شوێنێك ئەڕۆم و پاداشتم چی ئەبێت ؟ ئەویش فەرمووی (ﷺ) : «ئەڕۆیتە بەهەشت "ئەوێ پاداشتی تۆیە"» ئەوسا پیاوەکە ئەو دەنکە خورمایانەی لە

دەستی دابوو فڕێی دایە سەر زەوی، و بەرەو ناو بەرەی جەنگەکە ڕۆیشت و خەریکی شەڕ کردن بوو تاوەکو شەهید بوو . {بوخاری ئەگێڕێتەوە} .

هەروەها لە ﴿صەحیحی موسلیم﴾یش دا هاتووە لە ئەنەس (ﷺ) ئەگێڕێتەوە و ئەڵێت : پێغەمبەر (ﷺ) لە غەزای (بەدر)دا بە هاوەڵەکانی ئەفەرموو : «هەستن بڕۆنە ئەو بەهەشتەی کە تەنها پانیەکەی بە ئەندازەی ئاسمانەکان و زەوییە» . هەروەها "ئەنەس ڕووداوی عومەیر کوڕی (حمام)یشی گێرایەوە .

لە ﴿صەحیحی بوخاری﴾یش لە موغیرەی کوڕی شوعبە ئەگێڕێتەوە ، کە ئەڵێت : جارێکیان پێغەمبەر (ﷺ) هەواڵی پەیامی خوای پێداین و فەرمووی : «هەر کەس لە پێناوی خوادا شەهید بێت ئەچێتە ناو بەهەشت» .

هەروەها تیایدا هاتووە کە لە مەسروری کوڕی مەخرەمە و مەروان کوری حەکەم ئەگێڕێتەوە و ئەڵێت : لە غەزای "حودەیبیە" عمر (ﷺ) پرسیاری لە پێغەمبەری خوا (ﷺ) کرد و وتی : ئایا کوژراوەکانی ئێمە ئەڕۆنە بەهەشت و هی ئەوانیش ئەچنە دۆزەخ ؟ ئەویش فەرمووی : «بەڵێ "هی ئێمە بۆ بەهەشت ئەڕۆن و هی ئەوانیش بۆ دۆزەخ ئەچن"» . {بوخاری گێراویەتیەوە}

لە ﴿صەحیحی موسلیم﴾دا لە ئەبو موسا ئەگێڕێتەوە و ئەڵێت : پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی : «بەڕاستی دەرگاکانی بەهەشت وا لە ژێر سێبەری (شیر)ەکاندایە» . واتە : لەژێر سێبەری غەزا کردن لە پێناوی خوا دایە . {موسلیم گێراویەتەوە} .

ئەنەس (ﷺ) ئەگێڕێتەوە کە لە ﴿صەحیحی بوخاری﴾دا تۆمار کراوە ، و ئەڵێت : لە ڕۆژی "بەدر"دا حارثە ئەوکات گەنجێکی تازە پێگەیشتوو بوو ، لە جەنگەکە ئەپێکرێت و شەهید ئەبێت ، ئینجا دایکی دێتە لای پێغەمبەری خوا (ﷺ) و ئەڵێت : ئەی پێغەمبەری خوا پلە وپایەی "حارثە"م زانی ، خۆ ئەگەر هاتو بچێتە بەهەشت ئەوا ئارام ئەگرم و سوپاسی خوای گەورەی لەسەر ئەکەم ، بەڵام ئەگەر هاتو بچێتە شوێنەکەی دیکە چ کارێك بکەم باشە؟ ئەویش فەرمووی (ﷺ) : «ئای چەند باشی ، ئایا تەنها یەك بەهەشت هەیە؟ نەخێر ، لەڕاستیدا چەند

بەهەشتێکن ، ئەو ئەچێتە بەهەشتی "هەرە بەرز و خۆش" بەهەشتی فیردەوس». {بوخاری گێراویەتیەوە} .

ترمذی ، و حاکم لە فەرموودەی ئەبو هورەیرە (ﷺ) دەریانهێناوە ، ئەویش لە پێغەمبەر (ﷺ) "دوای ئەوەی جعفر شەهید ئەبێت" ئەفەرمووێت : «لە بەهەشت دا (جعفر)م لەگەڵ فریشتەکاندا بینی کە بە ئاسمانی بەهەشت دا ئەفڕین» . {ترمذی گێراویتیەوە} .

پێشەوا ئەحمەد ، و ئەبو یەعلا ، و ئیبن ئەبو دنیا لە فەرموودەی (ثابت) دەریانهێناوە ، ئەویش لە ئەنەس (ﷺ) ئەگێڕێتەوە و ئەڵێت : هەمو جاران پێغەمبەر (ﷺ) پێی خۆش بوو خەونی باش (الرؤیا الحسنة)ی بۆ بگێڕنەوە ، لەمبارەوە ئەیفەرموو : «ئایا هیچ کەسێك لە ئێوە "ئەم شەو" خەونی بینیوە» ، ئەوسا ئەگەر پیاوێك خەونێکی بدیبایە ، مەبەستەکەی نەزانیبایە ، ئەڕۆیشتە لای پێغەمبەر (ﷺ) و لەبارەی خەونەکەی پرسیاری لێ ئەکرد ، ئەویش بە گێڕانەوەی خەونەکە زۆر دڵخۆش ئەبوو . وتی : ئینجا جارێکیان ئافرەتێك هاتە لای پێغەمبەر (ﷺ) خەونێکی بینی بوو ، لە گێڕانەوەی خەونەکەی دا وتی : ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە خەوم دا خەوێکم بینی ، وەکو ئەوەوابو چومە دەرەوە ، هەندێك کەسیش هاتن منیان بردە بەهەشت ، لەوێ کۆمەڵێك هاتنە ناو بەهەشت ، زۆر کاریگەر بوون ، بەشێوەیەك بوون کە بەهەشت بۆیان کەوتە لەرزین ، تاوەکو سیانزە کەسم ژمارد کە هاتنە ناو بەهەشت "لەو کاتەی ئافرەتەکە ئەم خەونەی ئەگێڕێتەوە ، پێغەمبەر (ﷺ) پێشتر تاقمێکی بەرەو غەزا کردن ناردبوو" ، بەردەوام بوو لەسەر گێڕانەوەکەی وتی : پۆشاکی جوانی ڕازاوەی جوانیان لەبەر دابوو ، ئەوسا پێیان وتن : بیانبەنە ڕوباری بەرزەخ لەوێ با خۆیان بشۆن ، کە چونە سەر ڕوبارەکە خۆیان شۆرد ، پاش هاتنە دەرەوەیان ڕوویان وەکو مانگی چواردە ئەدرەوشایەوە ، پاشان چەند کورسیەکیان بۆ هێنان کە لە زێڕ دروست کرابو ، ئەوانیش لەسەری دانیشتن ، دواتر لە قاپێکی زێڕین هەندێك خورمایان بۆ هێنان ، ئەوانیش تاوەکو حەزیان کرد لێیان خوارد ، هەروەها لە میوەجاتی ئەوێشیان بەگوێرەی حەزی خۆیان خوارد ، منیش لەم خواردنە لەگەڵ ئەوان بەشداریم کرد . گێڕەرەوە ئەڵێت : لەوکاتەدا هەواڵنێرێك لەلایەن ئەم تاقمەی بۆ غەزا کردن نێردرابوو هات وتی : ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ)

زۆرمان لێ شەهید بوون ، تاوەکو سیانزە کەسی ژمارد ، پێغەمبەریش (ﷺ) فەرمووی : «بانگی ئافرەتەکەم بۆ بکەن ، کە ئافرەتەکە هاتەوە ئەوێ ، ئەویش فەرمووی : خەونەکەت بۆ ئەم پیاوە بگێڕەوە» . پاش ئەوەی ئافرەتەکە خەونەکەی بەدرێژی باس ئەکاتەوە ، پیاوەکە ئەڵێت : ڕوداوەکە وەکو ئەم ئافرەتە ئەڵێــت وەهایە ، فلان و فلان شەهید بوون تاوەکو سیانزە کەس ئەژمێرێت . {ئەحمەد گێڕاویەتیەوە ، کەسەکانیش ئەوانەی گێراویتیانەوە جێگەو متمانە و - صالح - ن} .

(لیث) کوری قیس لە (هذیل) ئەگێڕێتەوە ، ئەویش لە کوڕی مەسعود ئەگێڕێتەوە و ئەڵێــت : گیانی ئەوانەی کە شەهید بوون وا لەناو باڵندەی سەوز لەناو بەهەشت دا شوێنەکانیان لەژێر عەرش دایە هەرکات حەز بکەن بەناو بەهەشت دا هاتووچۆ ئەکەن ، و ئەوەی حەزیان لێبێت لەبەر دەستیان دایە ، پاشان بەرەو شوێنی تایبەتی خۆیان ئەگەڕێنەوە .

ئادەم کوری ئەبو ئیاس ئەگێڕێتەوە و ئەڵێت : وەرقاء لە کوڕی بابی جورەیج ئەگێڕێتەوە ، ئەڵێت : مجاهد لەبارەی ڕاڤــەی ئــەم ئایــەتەوە کە خوای گەورە ئەفەرمووێت :﴿ وَلَا تَحْسَبَنَّ ٱلَّذِينَ قُتِلُوا۟ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ أَمْوَٰتًۢا ۚ بَلْ أَحْيَآءٌ عِندَ رَبِّهِمْ يُرْزَقُونَ ﴾﴿ ئآل عمران: ١٦٩﴾ . ئەڵێت : ئەمانە زیندوون و لەلایەن خوای گەورە لە بەروبوومی بەهەشت دا ئەخۆن ، هەروەها بۆنی بەهەشتیشیان بۆ دێت لەکاتێك دا لەوێش نین .

ئیبن مبارك لە کوڕی جورەیج ئەگێڕێتەوە ، ئەویش لە مجاهد ئەگێڕێتەوە ، کە ئەڵێت : ئەوانە "واتە: شەهیدەکان" ئێستا لەناو بەهەشت دانین ، بەڵام لە بەروبوومەکەی ئەخۆن ، بۆنی بەهەشتیشیان بۆ دێت .

هەندێك جار ئەو فەرمودەیە بە بەڵگە ئەهێننەوە کە کوڕی ئیسحاق لە عاصم کوڕی عمر کوڕی قەتادەی ئەگێڕێتەوە ، ئەویش لە مەحمود کوری لبید ، ئەویش لە ئیبن عباس (ڕەزای خوایان لێبێت) ئەگێڕێتەوە و ئەڵێت : پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەفەرمووێت : «ئەوانەی شەهید بوون وا لەناو کۆشکێکی سەوز کە لەبەر دەرگای بەهەشت دا دروست کراوە و ئەڕوانێتە سەر

ڕوبارێکی ڕوون و بێگەرد ، هەموو ئێوارە و بەیانیەك خواردنیان لە بەهەشت بۆ دێت» . {ئەحمەد گێراویەتیەوە} .

کوڕی (مەندە) بەمشێوەیە ئەگێڕێتەوە و ئەڵێت : «لەناو بەهەشت دا ئەڕوانێتە سەر ڕووبارێکی ڕوون و بێگەرد» .

ئەمە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی ئەم ڕووبارە لە دەرەوەی بەهەشت دایە ... ئەمە لەوانەیە بەشێوەیەکی گشتی بۆ هەموو ئەوانە بێت کە شەهید بوون ، بەڵام ئەوانەی لەناو ئەو شوێنە تایبەتیانەی ژێر عەرش دان و بۆیان ئامادەکراوە ، ئەمانە ڕێزێکی تایبەتیان لێنراوە ، یاخود مەبەست لێرە ئەو شەهیدانەیە کە لە غەزا دا شەهید نەبوون ، وەکو ئەوەی بە نەخۆشی تاعون و سك ئێشە و خنکان و جگە لەوانە ، لە ئەو کەسانەی کە دەقی فەرموودەیان لەسەر هاتوە و بە شەهید هەژمار کراون .

فەرموودەکانی ڕابردوو هەموویان لەبارەی ئەو کەسانەیە کە لەڕێگای خوادا شەهید بوون ، هەندێکیان بە ڕاشکاوی باسی لێوە ئەکەن ، هەندێکیشیان ئایەتیان لەبارەیەوە هاتۆتە خوارەوە ، وەکو ئەم ئایەتەی ئەفەرموێت : ﴿ وَلَا تَحْسَبَنَّ ٱلَّذِينَ قُتِلُوا۟ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ أَمْوَٰتًۢا ۚ بَلْ أَحْيَآءٌ عِندَ رَبِّهِمْ يُرْزَقُونَ ﴾ ﴿آل عمران: ١٦٩﴾ . ئایەتەکە لەبارەی ئەو کەسانە هاتۆتە خوارەوە کە لە پێناو ئایینی خوای گەورە شەهید بوون .

هەندێك جار بە ئەو کەسانەش ئەوترێت شەهید کە بڕوایان هێناوە ، هەروەها بەڵگەش لەسەر ڕاست و دروستی بڕواکەیان هەیە ، هەروەکو خوای گەورە ئەفەرموێت : ﴿ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ بِٱللَّهِ وَرُسُلِهِۦٓ أُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلصِّدِّيقُونَ ۖ وَٱلشُّهَدَآءُ عِندَ رَبِّهِمْ ...\ واتە : ئەوانەی کە باوەڕیان هێناوە بە خواو پێغەمبەرەکانی ، ئا ئەوانە ڕاست و ڕاستگۆکانن، شەهیدەکانیش لەلای پەروەردگاریان ... ﴾ ﴿الحدید: ١٩﴾ .

کوڕی بابی نوجەیح ئەگێڕێتەوە و ئەڵێت : موجاهید لەبارەی ئەم ئایەتە ئەڵێت : ئەمانە بە بڕواهێنان بە تاك و تەنهایی خوای گەورە شاهیدی لەسەر خۆیان ئەدەن .

سوفیانیش لە پیاوێك ئەگێڕێتەوە ، و ئەڵێت : مجاهد وتی : هەموو بڕوادارێك لە هەمان کاتدا ڕاستگۆ و شەهیدیشە ، پاشان ئەم ئایەتەی خوێندەوە کە خوای گەورە ئەفەرمووێت :

﴿ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ بِٱللَّهِ وَرُسُلِهِۦٓ أُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلصِّدِّيقُونَ ۖ وَٱلشُّهَدَآءُ عِندَ رَبِّهِمْ ... ﴾ ﴿ الحدید: ١٩﴾ .

کوڕی بابی حاتم دەریهێناوە لە گێڕانەوەی ڕشدین کوڕی سەعد، ئەویش لە کوڕی عوقەیل ئەگێڕێتەوە ، ئەویش لە باوکی ، هەروەها ئەویش لە ئەبو هورەیرە (ﷺ) ئەگێڕێتەوە و ئەڵێت : جارێکیان ئەبو هورەیرە وتی : هەموتان ڕاستگۆ و شەهیدن . ئەوسا یەکێك لە ئامادە بوان وتی : مەبەستت چیە ئەی ئەبو هورەیرە ؟ ئەویش وتی : ئەم ئایەتە بخوێننەوە کە خوای گەورە ئەفەرموێت : ﴿ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ بِٱللَّهِ وَرُسُلِهِۦٓ أُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلصِّدِّيقُونَ ۖ وَٱلشُّهَدَآءُ عِندَ رَبِّهِمْ ... ﴾ ﴿الحدید: ١٩﴾ .ئەوسا ئەزانن مەبەست لە وتەکانم چیە .

هەروەها ڕاڤەی ئەم ئایەتەش پاڵپشتی لەم ڕایەی سەرەوە ئەکات ، کە خوای گەورە ئەفەرمووێت : ﴿ ...لِّتَكُونُوا۟ شُهَدَآءَ عَلَى ٱلنَّاسِ وَيَكُونَ ٱلرَّسُولُ عَلَيْكُمْ شَهِيدًا ...\ واتە : ... تا ببنە شایەت بەسەر خەڵکیەوە (تا بزانن ئەم ئایین و بەرنامەیە هەمووی مایەی خێر و سەربەرزیە بۆ تاك و کۆمەڵ لە هەموو سەردەمێکدا و لە هەموو بوارەکانی ژیاندا) و بۆ ئەوەی پێغەمبەریش (لە هەموو ئەو بوارانەدا مامۆستا و ڕابەری ئێوە بێت و لە ڕۆژی قیامەتدا) شایەتی بدات (بۆ دڵسۆزانی ئوممەتی لەسەر ئەوەی بە ئەرکی سەرشانی خۆیان هەستاون) ... ﴾ ﴿البقرە: ١٤٣﴾ . شاهیدیدانی ئەم گەلە "ئوممەتە" بۆ پێغەمبەران (سەلامی خوایان لێبێت) بە ڕاگەیاندنی پەیامەکانیانە .

بە هەر جۆرێك بێت هەموو ئەو فەرمودانەی لە پێش ئێستادا باس کران لەبارەی ئەو شەهیدانە بوون کە لەناو غەزادا گیانی خۆیان لە پێناو خوای گەورە دا بەخت کردوە , ئەمە هیچ





گومانی تێدا نیە ، بەڵام ئەوەی جێگەی سەرنج و تێڕامانە ئەو فەرموودەیەیە کە کوڕی ئیسحاق گێڕاویەتیەوە ، خوای گەورەش "لە هەمومان زاناترە" .

سەبارەت بە مایەوەی بڕواداران جگە لە ئەوانەی کە شەهیدن ، ئەوا بۆ دوو جۆر بەش ئەکرێن : یەکەمیان ئەوانەن کە تەکلیفی شەرعیان لەسەرە ، دووەمیان : ئەوانەن کە ئەم تەکلیفەیان لەسەر نیە ، وەکو منداڵی بڕواداران .

❊ ❊ ❊

## جۆری یەکەم
## ئەوانەی بە منداڵی مردوون

کۆمەڵێ زانایان لەسەر ئەوە هاوڕان کە هەموویان لەناو بەهەشت دان . لەمبارەیەوە پێشەوا ئەحمەد : هاوڕابون و کۆدەنگی زانایان لەسەر ئەمە باس ئەکات . لە گێڕانەوەیەکی جعفر کوری محمد هاتوە ئەڵێت : پێشەوا ئەحمەد لەمبارەیەوە ئەڵێت : هیچ جیاوازیەکی بیروڕا لەنێوان زانایان دا نیە لەبارەی منداڵانی بڕواداران کە هەمویان لەناو بەهەشت دان . لە گێڕانەوەی (مەیمونی)ش دا هاتوە پێشەوا ئەحمەد ئەڵێت : هیچ زانایەك گومانی لەوەدا نیە کە ئەوان وا لەناو بەهەشت دان .

(خلاڵ)یش لەڕێگەی حەنبەل ئەگێڕێتەوە و ئەڵێت : ئەحمەد لەمبارەیەوە ئەڵێت : ئێمە دانئەنێین کە بەهەشت "ئیستاکە" دروست کراوە ، هەروەها باوەڕیشمان وایە بەهەشت و دۆزەخ دروست کراون ، بۆنمونە خوای گەورە لە باسی سزای فرعەون و دارو دەستەکەی ئەفەرموێت : ﴿ ٱلنَّارُ يُعْرَضُونَ عَلَيْهَا غُدُوًّا وَعَشِيًّا ... \ واتە : ئاگری دۆزەخە لە (جیهانی بەرزەخ دا) بەیانیان و ئێواران ، نیشانیان دەدرێت ، یاخود پیایاندا دەچزێنرێت ... ﴾ ﴿غافر: ٤٦﴾ . وە ئەڵێت : گیانی منداڵانی موسڵمانیش لە بەهەشت دا وا لەناو باڵندەیەکی سەوز بە حەز و ویستی خۆیان ئەگەڕێن ، ئیبراهیم ی باوکیان (عليه السلام) سەرپەرشتیان ئەکات . ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە بەهەشت



و دۆزەخ ئێستا دروست کراون . بەهەمان شێوە پێشەوا (شافیعی)ش ڕای لەسەر ئەوەیە کە منداڵانی موسڵمان ئێستا لەناو بەهەشت دان .

هەروەها بە ڕاشکاوی زانایانی (پێشین)یش باسیان لەوە کردوە کە گیانی منداڵانی موسڵمان لەناو بەهەشت دایە ، هەروەك (لیث) لە باوکی قەیس ئەگێڕێتەوە ، ئەویش لە هذیل ئەگێڕێتەوە، و ئەڵێت لەمبارەیەوە کوڕی مەسعود ئەڵێت : گیانی ئەوانەی شەهید بوون لەناو باڵندەیەکی سەوز دان ، بەهۆیەوە ئەوەندەی حەزیان لێبێت و بە ئازادی بەناو بەهەشت دا هاتوڕچۆ ئەکەن ، هەروەها گیانی منداڵانی موسڵمانانیش لەناو چۆلەکەدان و بەهۆیەوە بە حەزو ویستی خۆیان لەناو بەهەشت دا ئەگەڕێن، و پاشان ئەگەڕێنەوە هێلانەکانیان کە بە عەرش دا هەڵواسراون . {کوڕی باوکی حاتم دەریهێناوە} .

کوڕی باوکی حاتم بەسەنەدەوە لە خالد کوڕی مەعدان ئەگێڕێتەوە و ئەڵێت : لەناو بەهەشت دا ، دارێك هەیە پێی ئەڵێن (طوبی) . هەمووی لەسەر شێوەی مەمك دروست کراوە ، تاوەکو لەوێ منداڵانی موسڵمان لەم دارە بەحەز و ویستی خۆیان (شیر)ی لێ بخۆن ، ئینجا لە دنیادا هەر دایکێك منداڵێکی لەبار بچێت ئەوا ئەچێتە ناو یەکێك لە ڕووبارەکانی بەهەشت و تا ڕۆژی زیندووربونەوە لەوێ ئەمێنێتەوە ، پاشان لەکاتی زیدووبونەوەدا لەسەر شێوەی مرۆڤێکی تەمەن چل ساڵە زیندوو ئەکرێتەوە .

ئەم فەرموودەیەی ئەنەسیش (ﷺ) کە لە ﴿صەحیحی موسلیم﴾دا تۆمار کراوە دروستی ئەمە ئەسەلمێنێت ، ئەنەس ئەڵێت : دوای ئەوەی "ئیبراهیم"ی کوڕی پێغەمبەر (ﷺ) کۆچی دوایی ئەکات ، پێغەمبەر (ﷺ) ئەفەرمووێت : «ئیبراهیمی کوڕم شیرە خۆرە بوو کاتێك مرد ، ئێستا لەناو بەهەشت دا شیری پێ ئەدرێت تاوەکو ماوەی شیر خواردنەکەی لەوێ تەواو بکات» . {موسلیم گێراویتیەوە} . ئیبن "ماجە"ش شێوەی ئەمەی لە فەرموودەی ئیبن عباس گێراوەتەوە .

هەروەها سەعید کوڕی مەنصور لە ئیسماعیل کوڕی عەیاش، ئەویش لە عبداللە کوڕی عثمان کوڕی (خثیم)، ئەویش لە مەکحول ئەگێڕێتەوە و ئەڵێت : پێغەمبەری خوا

(ﷺ)ئەفەرموێت : «گیانی منداڵانی موسڵمانە ئێستا لەناو چۆلەکەیەکاندان لەسەر دارێکی ناو بەهەشت، هەموو جارێك ئیبراهیمی باوکیان (ﷺ) سەردانیان ئەکات» .

لەلایەکی تروە بە (متصل)ی لە گێرانەوەی عبدالرحمن کوری ثابت کورِی ثوبان ئەویش لە عطاء کورِی عوروە ئەگێرێتەوە ، ئەویش لە عبداللە کورِی (ضمره) ، ئەویش لە ئەبو هورەیرە ئەگێرێتەوە و ئەڵێت : پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەفەرمووێت : «منداڵانی بڕواداران لەناو بەهەشت دان، ئیبراهیم (ﷺ) سەرپەرشتیان ئەکات» . ئیبن حەبان لە ﴿صەحیح﴾ەکەی خۆی باسی لێوە کردوە ، هەروەها "حاکم"یش گێراویەتیەوە ، ئەڵێت : سەنەدەکەی صەحیحە .

لەلایەکی دیکەوە لە گێرانەوەی موئمەل هاتوە و سوفیان ئەگێرێتەوە ئەویش لە ئیبن (ألاصبهانی) ، ئەویش لە باوکی حازم ، ئەویش لە ئەبو هورەیرە ئەگێرێتەوە و ئەڵێت : پێغەمبەر (ﷺ) ئەفەرمووێت : «منداڵانی موسڵمان ئێستا لە ماڵێکی شاخاوی ناو بەهەشت نیشتەجێن کە ئیبراهیم و سارە (سەلامی خوایان لێبێت) سەرپەرشتیان ئەکەن ئینجا کاتێك رۆژی زیندووبونەوە داهات و خەڵك هەمویان زیندووبونەوە ، منداڵەکان ڕادەستی باوانیان "واتە: باوك و دایکیان" ئەکرێنەوە» . {حاکم بە فەرموودەیەکی صەحیحی داناوە ، "ذهبی"ش لەگەڵیدا هاوڕایە} .

هەروەها ئەم فەرموودەیەی بوخاری گێراویەتیەوە وەکو بەڵگەیەکە بۆ سەلماندنی ئەمە کە لە (سمره)ی کورِی جندوب ئەگێرێتەوە و ئەویش لە پێغەمبەر (ﷺ) ئەگێرێتەوە : کە جارێکیان لە خەودا جبرائیل و میکائیل دێنە لای ، پاشان لەگەڵیان ئەڕواتە شوێنێك . فەرموودەکە بەدرێژی باس ئەکات ، تیایدا هاتوە : «لەوێدا "واتە : لەناو بەهەشت" گەیشتینە باخچەیەکی سەوزی جوان دارێکی بەرز و گەورەی لێبوو ، پیاوێکی پیریش لەوێ دانیشت بوو ، کە کۆمەڵێك منداڵی بەدەوریەوە بوون، ئینجا منبان بردە ناو خانوویێك هەرگیز ماڵێکی وەها جوانم نەبینیوە ، لەناو خانووەکە پیاو و ژن و منداڵ و پیر و گەنجی لێبوو» . هەروەها لە فەرمودەکەدا هاتوە : «ئینجا دوای گەشتەکە وتیان : سەبارەت بە ئەو پیاوە پیرەی لە نزیك دارەکە بینیت ئەوە ئیبراهیم (ﷺ) بوو ، بەڵام منداڵەکانی چواردەوری ئەمانە منداڵی موسڵمانن ، لەگێرانەوەیەکی دیکەدا هاتووە : هەموو تازە لەدایك بوێك کاتێکدا ئەمرێت ئەوا لەسەر سرووشتی خۆی "واتە :

منداڵەکان لەسەر ئەو سرووشتەی خوای گەورە لەسەری دروست کردوە کە موسڵمانەتیە" دەخرێتە ناو بەهەشت ، سەبارەت بە ئەو خانووەی کە لە سەرەتادا چویتە ناوی ئەمە خانووی گشتی بڕوادارانە ، بەڵام خانورەکەی دیکە ئەوە هی ئەوانەیە کە شەهید بوون» . {بوخاری گێراویەتیەوە}
.

طبرانی و حاکم دەریانهێناوە لە فەرمودەی سلیم کوڕی عامر ، ئەویش لە باوکی ئومامە ئەگێرێتەوە و ئەڵێت : پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی : «جارێکیان خەوتبووم ، لە خەوم دا منیان بردە چیایەکی سەخت» . فەرمموودەکەی بەدرێژی باس کرد ، تیایدا هاتوە : «پاشان منیان بردە شوێنێك لەنێوان دوو ڕووباردا کۆمەڵێك منداڵی لێبوون یارییان ئەکرد ، منیش وتم : ئەوانە کێن ؟ ئەوەی لەگەڵم بوو وتی : ئەمانە منداڵی بڕوادارانن کە ئیبراهیم (عليه السلام) سەرپەرشتیان ئەکات ، پاشان لەوێش ڕۆیشتین تاوەکو گەیشتمە شوێنێك کە (سێ) کەسی لێبوو ، بۆیە منیش وتم : ئەی ئەمانە کێنە ؟ ئەویش ووتی : "ئیبراهیم و موسا و عیسا"ن (سەلامی خوایان لێبێت) ئێستا چاوەڕێی تۆ ئەکەن» . {حاکم گێراویەتیەوە ، ئەڵێت : فەرموودەیەکی صەحیحە} .

هەندێك لە زانایانیش ڕایان لەسەر ئەوەیە : ئەمانەی باس کران "سەبارەت بە منداڵانی بڕواداران" بەشێوە گشتیەکەیەتی کە ئەچنە بەهەشت ، نەك تاك تاکیان ، هەروەك هەمان بڕواش بۆ بڕواداران هەیە کە بەشێوەیەکی گشتی ئەچنە بەهەشت ، نەك تاك تاکیان ، ئەمە ڕای ئیسحاق کوڕی (راهویە)یە ، کە ئیسحاق کوڕی مەنصور و حەرب لەویان گێڕاوەتەوە . لەوانەیە ئەمە سەبارەت بە منداڵێك بێت باوکی بڕوادار نەبوبێت ، بۆیە منداڵەکەشی لە هی بڕواداران هەژمار ناکرێت ، لەمەوە دەرئەکەوێت کە بارودۆخی تاك تاکی منداڵەکان لەڕووی بڕواوە وەك باوانەکانیان وەهایە .

بەهەمان شێوە هەندێك لە زانایانیش لەوانە : (أثرم) و بەیهەقیش هەمان ڕایان هەیە لەسەر ئەوەی کە تاك تاکی منداڵەکان وەکو تاك تاکی باوانەکانیان وەهایە ، ئەم زانایانە باس لەوەش ئەکەن کە ئیبن (عباس)یش هەمان تێڕوانینی هەیە . پێشەوا ئەحمەدیش باس ئەکات : کە ئیبن عباس لەم ڕایەیدا مەبەستی ئەو منداڵانەیە کە باوانیان لە هاوبەشکاران "مشرکین"ن ،

بەیهەقیش وتەی ئیبن عباسی بە دەربڕینە گشتیەکە وەرگرتوە ، هەروەك لەهەندێك گێرانەوەی فەرموودەی ئەبو هورەیرە هاتووە کە جارێکیان لەبارەی منداڵان پرسیار لە پێغەمبەر (ﷺ) کرا ئەویش لە وەڵامدا فەرموی : «خوای گەورە باشتر ئەزانێت کە ئەمانە چیان لێ بەسەر دێت» . بەڵام شارەزا و متمانە پێکراوەکانی فەرموودە ئەڵێن : پرسیارەکە لەبارەی ئەو منداڵانەیە کە دایك و باوکیان هاوبەش پەیداکەربوون .

هەروەها ئەوانەی کە ئەڵێن : منداڵەکان چارەنوسیان بەگوێرەی بیروباوەری باوانیانن ، ئەوا بەڵگەیان فەرموودەیە هێناوەتەوە کە موسلیم دەریهێناوە لە فەرموودەی فضیل کوری عەمر ، ئەویش لە عائشەی کچی طلحە ئەگێڕێتەوە ، ئەویش لە عائشەی "دایکی بڕواداران" (خوا لێی رازی بێت) ئەگێڕێتەوە ، و ئەڵێت : جارێکیان منداڵێك مرد ، منیش وتم : خۆشی بۆ خۆی ، ئێستا چۆلەکەیەکە لە "چۆلەکە"کانی ناو بەهەشت . پێغەمبەریش (ﷺ) فەرمووی: «ئایا نازانیت خوای گەورە بەهەشت و دۆزەخی دروست کردوە ، هەروەها بۆ بەهەشت هەندێك، و بۆ دۆزەخیش هەندێکی دروست کردوەن» . {موسلیم گێراویتیەوە} .

دیسان موسلیم لەرێگەی طلحە کوری یحیی ئەگێڕێتەوە ، ئەویش لە عائشەی کچی طلحە ئەگێڕێتەوە ، ئەویش لە عائشەی "دایکی بڕواداران" (خوا لێی ڕازی بێت) ئەگێڕێتەوە و ئەڵێت : جارێکیان پێغەمبەر (ﷺ) بانگکرا بۆ چونە سەر تەرمی منداڵە ئەنصاریەك تاوەکو بینێژن ، منیش لەوکاتەدا وتم : ئەی پێغەمبەری خوا خۆشی بۆ ئەو منداڵە ، چۆلەکەیەکە لە چۆلەکەکانی بەهەشت ، ئەوەندە نەژیاوە تاوەکو کاری خەراپە بکات . پێغەمبەریش (ﷺ) فەرمووی : «ئەی عائشە ! ئایا جگە لەمە شوێنی دیکەش نیە ؟ چونکە خوای گەورە خەڵکانێکی بۆ بەهەشت دروست کردون ، کە هێشتا لە پشتی باوانیان دان و نەهاتونەتە سەر دنیا» .

پێچەوانەی ئەم فەرموودەیەی سەرەوە ، ئەو فەرموودەیەیە کە موسلیم دەریهێناوە لە فەرمودەی باوکی سەلیل ، ئەویش لە باوکیەو حەسان ئەگێڕێتەوە و ئەڵێت : جارێکیان بە ئەبو هورەیرە م وت : دوو کچم مردوون ، تۆش فەرمودەت لە پێغەمبەر (ﷺ) گێڕاوەتەوە ، کەوابو فەرموودەیەکمان لەمبارەوە بۆ بگێڕەوە تاوەکو هەندێك دڵخۆشیمان بۆ بگەڕێتەوە لەوەی کە لێمان

مردوون . ئەویش وتی : بەڵێ . "پێغەمبەر (ﷺ) ئەفەرموێت" : « لە ڕۆژی زیندوو بونەوەدا منداڵی موسڵمانان پێشڕەوی خەڵکانی بەهەشتن ، ئینجا کاتێك بە باوك و دایکیان ئەگەن ، جلی ئەوان ئەگرن "یان ووتی : دەستی ئەوان ئەگرن" هەروەکو من گۆشەیەکی پۆشاکەکەی تۆ ئەگرم ، وازناهێنێن تاوەکو ئەمانبەنە ناو بەهەشت» . {موسلیم گێراویتیەوە} .

لە ﴿صەحیحی بوخاری و موسلیم﴾دا هاتوە ، و لە ئەنەس (ﷺ) ئەگێڕێتەوە ، ئەویش لە پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەگێڕێتەوە کە ئەفەرموێت : «هەر موسڵمانێك سێ منداڵی بە بچووکی لێ بمرێت ، ئەوا بە هۆی میهرەبانی ئەوان ئەچنە بەهەشت» . {بوخاری گێراویەتیەوە} .

هەر لەبەر ئەمەیە پێشەوا ئەحمەد ئەڵێت : ئەوان تکاکاری باوك و دایکیانن ، کەوابو چۆن گومان لە ئەوان ئەکرێت لەوەی کە ئایا ئەچنە بەهەشت یاخود نا . واتە : ئەوان تکا بۆ باوك و دایکیان ئەکەن تاوەکو بەهۆیەوە بچنە بەهەشت .

سەبارەت بەو دوو فەرمودەیەی ڕابردوو ، لەوانەیە پێغەمبەر (ﷺ) بۆیە لەسەرەتادا ڕێگری کرد لەوەی گەواهی بدرێت لەسەر ئەوەی منداڵی موسڵمانان ئەچنە ناو بەهەشت چونکە هیچ ڕونکردنەوەیەکی لەلایەن خوای گەورەوە پێ نەگەیشت بوو ، چونکە گەواهی دان پێویستی بە ئاگاداربوون و هەبوونی زانیاریە لەسەر بابەتەکە ، بەڵام دوای ئەوەی خوای گەورە پێغەمبەری (ﷺ) لێ ئاگادار کردەوە ، ئەویش بە موسڵمانانی ڕاگەیاند ، خوای گەورەش لە هەموومان زاناترە .

❊ ❊ ❊

## جۆری دووەم

## ئەو بڕوادارانەی جگە لە شەهیدەکان کە تەکلیفی شەرعیان لەسەرە

زانایان لە کۆن و تازە ڕای جیاوازیان لەوبارەیەوە هەیە ، ئەوەی لە پێشەوا ئەحمەدیش بەشێوەی دەق هاتوە ئەوەیە : کە گیانی بڕواداران لەناو بەهەشت دایە ، (خلال) لە پەرتووکی «السنە»دا لە زۆر ڕێگەوە گواستۆتەوە ، ئەویش لە حنبل گێراویەتیەوە کە ئەڵێت : گوێم لە باوکی عبداللە بوو ئەیوت : گیانی بێباوەڕەکان وا لەناو دۆزەخ دایە ، هەروەها گیانی ئەوانەی بڕوادارن لەناو بەهەشت دایە . بەهەمان شێوە حنبل لە شوێنێکی دیکەدا ئەڵێت : ئەو ئەڵێت : بەشێوەیەکی گشتی گیانی بڕواداران لەناو بەهەشت دایە ، هەروەها گیانی ئەوانەی بێباوەڕن لەناو دۆزەخ دایە ، سەبارەت بە جەستەش ئەوا لە دنیادا لەناو "گۆڕدا"یە ، ئەوەی خوای گەورە بیەوێت سزای ئەدات ، هەروەها ئەوەی بشیەوێت بە میهرەبانی خۆی لەگەڵی ئەجوڵێتەوە .

باوکی عبداللە ئەڵێت : ئێمە ناڵێین بەهەشت و دۆزەخ لەناو ئەچن ، بەڵکو لەگەڵ ئەوەی خوای گەورە پێی ئاگادارە ، تاهەتایە ئەمێننەوە ، بەگوێرەی کردەوەکان مرۆڤەکانێ دەچنە یەکێك لەو شوێنانە ، داوا لە خوای گەورە ئەکەین کە دامەزراومان بکات لەسەر بڕوا ، هەروەها دڵمان لە ڕێ لانەدات پاش ئەوەی کە ڕێنمونی کردوین بۆ سەر ڕێگای ڕاست ...

خەلال ئەڵێت : عبداللە کوری أحمد کوری حنبل هەواڵی پێداین و ووتی : جارێکیان پرسیارم لەبارەی (گیانی مردوان) لێکرد لەوەی کە ئایا لەناو گۆڕدا ئەمێنێتەوە ، یان دەچنە ناو لاشەی باڵندە ، یاخود وەکو لاشە ئەمرێت ؟ ئەویش لە وەڵامدا ووتی : ئەگێرنەوە لە پێغەمبەر (ﷺ) لەمبارەیەوە ئەفەرمووێت : «بڕوادار کاتێك ئەمرێت ئەوا گیانەکەی لەناو بەهەشت دا بە دارێك پەیوەست ئەبێت تاوەکو ئەو ڕۆژەی کە زیندوو ئەکرێنەوە» . {ئەحمەد گێراویەتیەوە} .

ئیبن مەندە لە فەرموودەی باوکی هاشم دەریهێناوە ، ئەویش لە عەبدوڵڵای کوری مەسعود ئەگێڕێتەوە ، تیایدا باسی مردنی بڕوادار ئەکات ، هەروەها کاتێك لەناو گۆڕدا فریشتەی پرسیارکەر دێت ئەوە گیانەکەی ئەگەرێتەوە ناو لاشە ، پاشان گیانەکەی بەرز ئەکرێتەوە بۆ

ئاسمانى حەوتەم . دوايى عبدالله ئەم ئايەتەى خوێندەوە : ﴿ كَلَّآ إِنَّ كِتَٰبَ ٱلْأَبْرَارِ لَفِى عِلِّيِّينَ ﴿١٨﴾ وَمَآ أَدْرَىٰكَ مَا عِلِّيُّونَ ﴿١٩﴾ كِتَٰبٌ مَّرْقُومٌ ﴿٢٠﴾ \ واتە : نەخێر (دەستەى سەرفرازان دوورن لەو تەنگانەيە) بەڵكو نامەى كردەوەكانيان ، دۆسيەى رەفتاريان وا لە شوێنە بەرزو بڵندەكاندا * جا تۆ چووزانى (عليون) چيەو چۆنە؟ * نامەيەكى (ديارو ئاشكرايە ، هەر بە ڕواڵتيدا ديارە كە خاوەنەكەى سەرفراز و بەختەوەرە) مۆركراوو لۆك كراويشە ﴾ ﴿المطففين: ١٨ – ٢٠﴾ . وتى : ئەمە لە ئاسمانى حەوتەمە .

بەلام سەبارەت بە بێباوەڕ "ئەوا بەدرێژى باسى ئەوانيشى كرد" و ئەم ئايەتەشى خوێندەوە : ﴿ كَلَّآ إِنَّ كِتَٰبَ ٱلْفُجَّارِ لَفِى سِجِّينٍ ﴿٧﴾ وَمَآ أَدْرَىٰكَ مَا سِجِّينٌ ﴿٨﴾ \ واتە : واز بهێنن لە تەرازووبازى ، چونكە بەڕاستى نامەى كردەوەى تاوانباران لە (سجين) دايە * جا تۆ چووزانى (سجين) چيە؟ ﴾ ﴿ المطففين: ٧ – ٨﴾ . وتى : ئەمە لە زەوى حەوتەمە .

سەعيد لە قەتادە ئەگێڕێتەوە و ئەڵێت : بۆيان باس كردين كە عبدالله كوڕى عەمر هەمو جاران ئەيوت : لە (سجين) دا ، كە بريتى يە لەو زەويەى خوارەوە كە گيانى بێباوەڕەكانى تێدايە .

ئيبن مبارەك لە ئيبن (لەهيعە) ئەگێڕێتەوە ، ئەويش لە يەزيد كوڕى باوكى حەبيب ئەگێڕێتەوە و ئەڵێت : مەنصور كوڕى باوكى مەنصور بۆى باس كرد و ووتى : پرسيارم لە عبدالله كوڕى عەمر كرد لەبارەى گيانى موسڵمانان لەو كاتەى كە ئەمرن ، ئايا چيان لىٚ بەسەر دێت ؟ ئەويش وتى : ئەى خەڵكى عيراق ئێوە چى ئەڵێن ؟ منيش وتم : نازانم . ئەويش وتى : ئەوانە لەوێنەى باڵندەيەكى سپى لە ژێر سێبەرى عەرش دان . بەلام گيانى بێباوەڕەكان وا لەناو زەوى حەوتەم دايە .

ديسان لە كەعب ئەگێڕێتەوە ، ئەويش لە هلال كوڕى يەساف ئەگێڕێتەوە و ئەڵێت : جارێكيان ئێمە لەلاى كەعب دانيشتبووين ، لەوكاتەش دا ئيبن عباس هات و وتى : ئەى كەعب

هەموو شتێك لەبارەی قورئان ئەزانم تەنها چوار شت نەبێ ، كەوابو ئەم چوار شتەشم پێبڵێ ، ئینجا پرسیاری لە "سجین" و "علیین" كرد . كەعبیش لەوەلاّمدا وتی : علیین بریتیە لە ئاسمانی حەوتەم ، كە گیانی بڕوادارانی لێیە . بەلاّم سجین زەوی حەوتەمی خوارەوەیە ، كە گیانی بێباوەڕان و ئیبلیس ی لێیە .

بە بەڵگەوە سەلمێنراوە بەهەشت لەسەرەوەی ئاسمانی حەوتەمە ، هەروەها دۆزەخیش لەژێر زەوی حەوتەم دایە ، ئەمەشمان بەدرێژی لە پەرتوكی "صفة النار[1]" باس كردوە .

باوكی نەعیم لە ڕێگەی حەكەم كوری (أبان) ئەگێرێتەوە و ئەلێت :

جارێكیان میوانێكی خەڵكی (صەنعا)م هەبوو. ئەویش وتی : گوێم لە وەهەب كوڕی (منبە) بوو ئەیوت : خوای گەورە خانوێكی لە ئاسمانی حەوتەم هەیە پێی ئەڵێن : "البیضاء" ، كە تیایدا گیانی بڕواداران كۆ ئەبنەوە ، ئینجا هەر كاتێك یەكێك لە دنیادا ئەمرێت و ئەگات بە گیانەكان ، ئەوانیش پرسیاری خەڵكی دنیایان لێ ئەپرسن ، هەروەكو یەكێك كە لە گەشتێك بوبێت و ماوەیەكی درێژی پێ چوبێت كاتێك دێتەوە ناو كەس و كاری ، ئەوسا لە هەواڵیان ئەپرسێت ، ئەمانیش وەهانە .

لالكائی لە گێرانەوەی عاصم دەریهێناوە ، ئەویش لە باوكی وائل ئەگێرێتەوە ، ئەویش لە ئەبو موسای ئەشعەری ئەگێرێتەوە و ئەڵێت : گیانی بڕواداران كاتێ لەلاشەكەی دێتە دەرەوە بۆنی لە میسك خۆشترە ، پاشان فریشتەكان بۆ لای خوای گەورە بەرزی ئەكەنەوە ، هەروەها گیانی بێباوەڕانیش ، كاتێك فریشتەكان لەناو لاشەكەیان دێننە دەرەوە بۆنیان لە لاشەیەكی بۆگەن كردوو ناخۆشترە ، شوێنیشیان لە خوارەوەی چینی حەوتەمی زەویدان .

ئەوانەی ئەڵێن : گیانی بڕواداران وا لەناو بەهەشت دایە ، هەروەها گیانی بێباوەڕانیش لەناو دۆزەخ دایە ، بەڵگەی قورئانی بەم ئایەتانە ئەهێننەوە ، وەكو : ﴿ فَلَوْلَآ إِذَا بَلَغَتِ ٱلْحُلْقُومَ

---

[1] دانەر لەمەدا ئاماژە بۆ پەرتوكی " التخويف من النار " ئەكات .

﴿وَأَنتُمْ حِينَئِذٍ تَنظُرُونَ ﴿٨٤﴾ وَنَحْنُ أَقْرَبُ إِلَيْهِ مِنكُمْ وَلَٰكِن لَّا تُبْصِرُونَ ﴿٨٥﴾﴾ \ واتە : باشە ، ئێوە بۆ بیرناکەنەوە ، ڕۆژێك دێت کە ڕۆحتان دەگاتە گەروتان * ئێوەش بە دەوری ئەو کەسەدا بێ دەسەڵاتانە تەماشا دەکەن و سەرنج دەدەن * لەکاتێکدا کە ئێمە لە ئێوە نزیکترین لێی ، بەڵام ئێوە نامانبینن . ﴾ ﴿الواقعە: ٨٣ – ٨٥﴾ .

هەروەها ئەم ئایەتانەی هەمان سورەتیش کە خوای گەورە ئەفەرموێت : ﴿ فَأَمَّا إِن كَانَ مِنَ الْمُقَرَّبِينَ ﴿٨٨﴾ فَرَوْحٌ وَرَيْحَانٌ وَجَنَّتُ نَعِيمٍ ﴿٨٩﴾ وَأَمَّا إِن كَانَ مِنْ أَصْحَابِ الْيَمِينِ ﴿٩٠﴾ فَسَلَامٌ لَّكَ مِنْ أَصْحَابِ الْيَمِينِ ﴿٩١﴾ وَأَمَّا إِن كَانَ مِنَ الْمُكَذِّبِينَ الضَّالِّينَ ﴿٩٢﴾ فَنُزُلٌ مِّنْ حَمِيمٍ ﴿٩٣﴾ وَتَصْلِيَةُ جَحِيمٍ ﴿٩٤﴾ \ واتە : جا ئەو کەسەی کە لە سەرەمەرگدایە لە نزیکان و خۆشەویستانی ئێمە بێت * ئەوە ئیتر خۆشی و کامەرانی و ئاسوودەیی بەهەشتی پڕ لە ناز و نیعمەت چاوەڕێیەتی * خۆ ئەگەر لە دەستەی ڕاستانیش بێت * ئەوە لەلایەن دەستەی ڕاستانەوە سڵاوت پێشکەش دەکرێت * بەڵام ئەگەر لە دەستەی ئەوانە بێت کە گومڕان و بڕوایان بە بەرنامەی خوا نیە ... * بە ئاوی لە کوڵ پێشوازیی لێ دەکرێت ... * دەگەیەنرێتە دۆزەخ ﴾ ﴿الواقعة: ٨٨ – ٩٤﴾ . ئەمە سەبارەت بە بێباوەڕانە ، کە بریتیە لە چونیان بۆ ناو ئاگری دۆزەخ و ئازاردان و سوتاندنیان . ئەمە هەمووی لەدوای سەرەمەرگ و مردنیانەوە دێت .

هەروەها فەرموودەی خوای گەورە کاتێك چیرۆکی ئەو بڕوادارەی کە لە سورەتی ﴿یس﴾ دا باس کراوە ئەفەرموێت : ﴿ قِيلَ ادْخُلِ الْجَنَّةَ ۖ قَالَ يَا لَيْتَ قَوْمِي يَعْلَمُونَ ﴿٢٦﴾ بِمَا غَفَرَ لِي رَبِّي وَجَعَلَنِي مِنَ الْمُكْرَمِينَ ﴿٢٧﴾ \ واتە : (دیارە ، خوانەناسان پەلاماریان داوە و شەهیدیان کردووە) بۆیە پێی وتراوە: فەرموو بۆ ناو بەهەشت ، لەوێشەوە هەر دڵسۆزانە وتویەتی : خۆزگە قەومەکەم بیانزانیایە سەرئەنجای ئیمان چۆنە و کەوتوومەتە ناو (چ) ناز و نیعمەتێکەوە * بەهۆی ئەوەوە کە پەروەردگارم لێم خۆشبووە و خستمیە ڕیزی ڕێزلێگیراوانەوە ﴾ ﴿ یس: ٢٦ – ٢٧﴾ . ئەمە وتەی



بڕواداره‌که‌یه دوای ئه‌وه‌ی که ئه‌کوژرێت ، بزانه خوای گه‌وره (ﷻ) چ ناز و نیعمه‌تێکی بۆ ئاماده کردوه . هه‌روه‌ها ئه‌م فه‌رمووده‌یه‌ی خوای گه‌وره کاتێك ئه‌فه‌رموویت : ﴿ يَا أَيَّتُهَا النَّفْسُ الْمُطْمَئِنَّةُ ﴿٢٧﴾ ارْجِعِي إِلَى رَبِّكِ رَاضِيَةً مَرْضِيَّةً ﴿٢٨﴾ فَادْخُلِي فِي عِبَادِي ﴿٢٩﴾ وَادْخُلِي جَنَّتِي ﴿٣٠﴾ \ واته : (شایانی باسه به ئیمانداری سه‌رفراز له سه‌ره‌مه‌رگدا ده‌وترێت ) ئه‌ی خاوه‌نی دڵ و ده‌روونی پڕ له ئارامی (ئه‌ی ئاده‌میزادی ژیر و هۆشمه‌ند که له ته‌مه‌نی کۆتای دنیادا په‌روه‌ردگارت ناسی و به‌جوانی ده‌تپه‌رست...) * بگه‌ڕێره‌وه بۆ لای په‌روه‌ردگارت که تۆ له‌و رازیت و ئه‌ویش له تۆ رازیه * ده بچۆره ریزی به‌نده چاکه نازدار و به‌ڕێزاکانمه‌وه * بچۆره به‌هه‌شته خۆشه رازاوه‌که‌مه‌وه ﴾ ﴿الفجر: ٢٧ – ٣٠﴾ .

به‌هه‌مان شێوه ئه‌م فه‌رمووده‌یه‌ی خوای گه‌وره کاتێك ئه‌فه‌رموێت : ﴿ فَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّنِ افْتَرَى عَلَى اللَّهِ كَذِبًا أَوْ كَذَّبَ بِآيَاتِهِ أُولَئِكَ يَنَالُهُمْ نَصِيبُهُمْ مِنَ الْكِتَابِ حَتَّى إِذَا جَاءَتْهُمْ رُسُلُنَا يَتَوَفَّوْنَهُمْ قَالُوا أَيْنَ مَا كُنْتُمْ تَدْعُونَ مِنْ دُونِ اللَّهِ قَالُوا ضَلُّوا عَنَّا وَشَهِدُوا عَلَى أَنْفُسِهِمْ أَنَّهُمْ كَانُوا كَافِرِينَ ﴿٣٧﴾ قَالَ ادْخُلُوا فِي أُمَمٍ قَدْ خَلَتْ مِنْ قَبْلِكُمْ مِنَ الْجِنِّ وَالْإِنْسِ فِي النَّارِ ... ﴿٣٨﴾ \ واته : جا کێ له‌وه سته‌مکارتره که به‌ده‌م خواوه درۆ هه‌ڵده‌به‌ستێت ، یان بڕوای به ئایه‌ته‌کانی نه‌هێناوه ، ئا ئه‌وانه ئه‌وه‌ی که بۆیان بڕیار دراوه له دنیادا ده‌ستیان ده‌که‌وێت ، هه‌تا ئه‌و کاته‌ی فریشته نێردراوه‌کانمان بۆیان دێن گیانیان ده‌کێشن ، ئه‌وسا پێیان ده‌ڵێن : کوان ئه‌وانی جگه له خوا هانا و هاوارتان بۆ ده‌بردن و ده‌تانپه‌رستن ؟! (به‌سه‌رسامیه‌وه) ده‌ڵێن : (نازانین) لێمان ون بوون ، (ئه‌وسا به‌ناچاریی) شایه‌تی له خۆیان ده‌ده‌ن که به‌ڕاستی ئه‌وان هه‌ر بێ باوه‌ڕ بوون * (ئه‌وسا خوا فه‌رمانیدا) و فه‌مووی : ده بچنه ریزی ئه‌و کۆمه‌ڵانه‌وه که پێش ئێوه هه‌بوون (له گومڕاکان) له ده‌سته‌ی په‌ری و ئاده‌میزاده‌کان له‌ناو دۆزه‌خدا ... ﴾ ﴿الأعراف: ٣٧ – ٣٨﴾ .

هاوشێوەی ئەم ئایەتەش ئەمەیە کاتێك ئەفەرموێت : ﴿ ٱلَّذِينَ تَتَوَفَّىٰهُمُ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ ظَالِمِيٓ أَنفُسِهِمۡۖ فَأَلۡقَوُاْ ٱلسَّلَمَ مَا كُنَّا نَعۡمَلُ مِن سُوٓءِۭۚ بَلَىٰٓۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمُۢ بِمَا كُنتُمۡ تَعۡمَلُونَ ﴿٢٨﴾ فَٱدۡخُلُوٓاْ أَبۡوَٰبَ جَهَنَّمَ خَٰلِدِينَ فِيهَاۖ فَلَبِئۡسَ مَثۡوَى ٱلۡمُتَكَبِّرِينَ ﴿٢٩﴾ ﴾ واتە : ئەوانەی کە فریشتەکان لە سەرەمەرگدا گیانیان دەکێشن ، لە کاتێکدا کە بەردەوامن لەسەر ستەم لە خۆیان (بەهۆی بێباوەڕی و یاخی بوونیانەوە) ئەوسا بەناچاری تەسلیم ئەبن و دەڵێن : ئێمە هیچ گوناهو هەڵەیەکمان نەکردووە ، فریشتەکان دەڵێن : نەخێر وا نی یە (ئەوە ئێوە لە بیرتان کردووە) ئەگینا بەڕاستی خوا ئاگادار و زانایە بەهەموو ئەو کار و کردەوانەی کە دەتانکرد و ئەنجامتان دەدا ※ کەواتە لە دەروازەکانی دۆزەخەوە بچنە ژوورەوە و بۆ هەمیشەیی و نەبڕاوەش تیادا بن ، ئای کە جێگە و ڕێگەی خۆ بەزل زانەکان ناخۆش و نالەبار و ناسۆرە ﴾ ﴿النحل: ٢٨ – ٢٩﴾ .

هەروەها لە فەرمودەی پێغەمبەریش (ﷺ) لەمبارەیەوە کە وەکو بەڵگە بەکاردێت ، ئەوەیە کە (مجاهد) لە (شەعبی) ئەگێرێتەوە ، ئەویش لە (جابر) ئەگێرێتەوە و ئەڵێت : جارێکیان لەبارەی (خەدیجە) "ڕەزای خوای لێبێت" پاش ئەوەی کە کۆچی دوایی ئەکات ، پرسیار لە پێغەمبەر (ﷺ) کرا ئەویش فەرمووی : «لەسەر یەکێك لە ڕوبارەکانی بەهەشت لەناو خانووێکی لە قامیش دروستکراودا بینیم کە هیچ ناتەواویەکی تێدا نەبوو» . {بەزار و طبرانی دەریانهێناوە} .

دیسان طبرانی بە سەنەدێکی پچڕاو "منقطع" دەریهێناوە ، لە فاطمە (ڕەزای خوای لێبێت) ئەگێرێتەوە و ئەڵێت : جارێکیان وتم بە پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئایا دایکمان خەدیجە (ڕەزای خوای لێبێت) ئێستا لەکوێیە ؟ ئەویش فەرمووی: «لەناو بەهەشت دا لەناو خانووێکی ڕازاوە و جوانی لە قامیش دروستکراودا لەگەڵ مریم و ئاسیەی خێزانی فیرعەون دایە» . وتی : چ جۆرە قامیشێکە ؟ ئەویش فەرمووی : «قامیشێکی ڕازێندراوە بە یاقوت و مەرجان» .

ئەبو داود لە ﴿سننە﴾ دەریهێناوە لە فەرموودەی ئەبو هورەیرە ، کە ئەڵێت : دوای ئەوەی کە ئەسلەمی هاتە لای پێغەمبەر (ﷺ) ، ئەوسا دانی نا بەوەی کە تاوانی زینای ئەنجام داوە ،

پاشان ڕەجم کرا ، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی : «سوێند بە ئەو کەسەی کە گیانی منی بەدەستە "ئەسلەمی" ئێستا وا لەناو ڕووباری بەهەشت دایە» . {ئەبو داود گێراویتیەوە ، فەرموودەیەکی صەحیحە} .

❊ ❊ ❊

## وچانێك

لەڕاستیدا کاتێك گیانی بڕواداران و ئەوانەی کە شەهید بوون ئەچنە بەهەشت ئەگەر هیچ ڕێگریەك لەئارادا نەبێت ، لەوەی کە تاوانێکی گەورەیان ئەنجام دابێت ، خوای گەورەش لێی خۆش نەبوبێت ، یاخود مافی ئەوانی دیکەی لەسەر مابێـت هەتاوەکو ئەمانەی لەسەر لانەکەون ئەوە ناڕۆنە ناو بەهشت .

هەروەك لە ﴿صەحیحی بوخاری و موسلیم﴾دا هاتووە، لە ئەبو هورەیرە ئەگێڕێتەوە و ئەڵێت : لە غەزای خەیبەردا یەکێك شەهید ئەبێت و خەڵکەکەش ئەڵێن : خۆشی بۆ خۆی ئەچێتە ناو بەهەشت ، پێغەمبەری خواش (ﷺ) فەرمووی : «نەخێر ، سوێند بە ئەو کەسەی کە گیانی منی بەدەستە بەهۆی ئەو پۆشاکەی لە ڕۆژی خەیبەردا بردوویەتی کە هێشتا مافی خەڵکیشی بەسەرەوە مابو ، چونکە بەسەر خەڵکدا دابەش نەکرابوو ، ئـەوهـەندەی بـەسە بۆ ئەوەی بەهۆیەوە بچێتە ناو دۆزەخ ، و توشی سزا ببێـت» . {بوخاری گێراویتیەوە} .

سەمرەی کوڕی جوندوب ئەگێڕێتەوە و ئەڵێت : جارێکیان پێغەمبەری خوا (ﷺ) پێش نوێژی بۆ ئێمە کرد ، پاشان سێ جاران فەرمووی : «ئالێرەدا ئەوەی فلانەکەس وەستاوە و ناچێتە ناو بەهەشت» لەم کاتەدا کەس وەڵامی نەدایەوە ، دوایی پیاوێك لە ئامادەبوان پرسیاری ڕونکردنەوەی ئەم وتەیەی لێکرد ، ئەویش فەرمووی (ﷺ) : «ئەو پیاوەی کە مرد بەهۆی ئەو قەرزەی کە لەسەری بوو ڕێی بەهەشتی لێگیرا ، ئنجا ئەگەر حەز بکەن ڕزگاری ئەکەن ، ئەگەرنا ئەوا توشی سزای خوای گەورەی ئەکەن» . {پێشەوا ئەحمەد ، و ئـەبـو داود ، و نەسائی بە دەربڕینی جیاواز دەریانهێناوە ، سەنەدەکەشی حسن - ە} .

بـەزار لە فەرمودەی ئیبن عباس دەریهێناوە و ئەڵێت : ئەویش لە پێغەمبەری خوا (ﷺ) شێوەی ئەم فەرمودەیەی ڕابردو ئەگێڕێتەوە ، کە لە فەرمودەکەدا هاتووە ئەفەرموێت : «هاوڕێیەکەتان لە نزیك دەرگای بەهەشت بەهۆی ئەو قەرزەی لەسەریەتی ڕێگەی چونە ژوورەوەی لێ گیراوە» .

پێشەوا ئەحمد و ترمذی و ئیبن ماجە لە فەرموودەی ثوبان دەریانهێناوە و لە پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەگێڕێتەوە کە ئەفەرمووێت : «هەرکەسێك گیانی لەلاشەی جیاببێتەوە لەهەمان کاتیشدا سێ شتی لەسەر نەبێـت ئەچێتە ناو بەهەشت : خۆ بەگەورە زانین ، هەروەها ماڵی حەڕام، ئینجا هەبوونی قەرز لەسەری» . {پێشەوا ئەحمەد گێڕاویتیەوە ، فەرموودەیەکی صەحیحە} .

هەروەها ئەم فەرموودەیەی کە ئیبن عمر لە پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەگێڕێتەوە و ئەفەرموێت : «ئەگەر هاتو هەریەکێك لەئێوە مرد ئەوا هەموو بەیانی و ئێوارەیەك شوێنەکەی خۆی نیشان ئەدرێت ، ئینجا ئەگەر هاتور لەو کەسانە بێت کە خەڵکی بەهەشتن ئەوا بەهەشتی نیشان ئەدرێت ، ئەگەرنا دۆزەخی پێنیشان ئەدەن ، هەروەها پێشی ئەووترێـت : ئەمە لە داهاتودا کە زیندووبویەوە شوێنی تۆیە» . {بوخاری گێڕاویەتیەوە} . ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە گیانەکان ئێستا لەناو بەهەشت دانین ، بەڵکو هەموو بەیانی و ئێوارەیەك نیشانیان ئەدرێت ، بەهەمان شێوە ئیبن عطیە و جگە لەویش باسیان لێوە کردوە .

سەبارەت بە سەلام کردن لە خەڵکی گۆڕستان، هیچ بەڵگەیەك لەبەر دەست دانیە کە بیسەلمێنێت گیانەکان لەناو گۆڕەکانیان بە لاشەکانیانەوە بەندن ، چونکە لەبارێکدا سەلام لە پێغەمبەران و ئەوانەی کە شەهیدبوون ئەکرێت لەکاتێك دا گیانەکانیان وا لە بەرزایی ئاسمانەکان لە (أعلی علیین)دایە ، بەڵام لەگەڵ ئەوەش پەیوەندیەکی بەهێز هەیە لەنێوان لاشە و گیانەکانیان ، هەرچەندە چۆنیەتی و شێوە ڕاستیەکەی تەنها خوای گەورە ئەزانێت چۆنە، ئەگەرنا کەس زانیاری دروستی لەم بارەیەوە نیە

بەڵگەش بۆ ئەمە هەندێك فەرموودەی (مرفوع، و موقوف)هەن كە لە هاوەڵانی وەكو ئەبو دەرداء و عبدالله كوڕی عەمر كوڕی عاص (خوای گەورە لێیان ڕازی بێت) گێڕدراوەتەوە . لەوەی گیانی نوستوو بەرز ئەبێـتەوە بۆ عەرش لەگەڵ ئەوەی پەیوەندی بەهێزیشی هەیە لەگەڵ لاشەكەی ، پاشان لە كاتی بە ئاگا هاتنی ، بە خێرایی یەكی زۆرەوە ئەگەڕێتەوە ناو لاشەكەی . بەهەمان شێوە ئەو گیانانەی كە لەلاشەكانیان جیابونەتەوە لەپێشترن لەوەی بچنە ئاسمان و بەهەمان ئەم خێراییەش بۆ لاشەكانیان بگەڕێنەوە ، خوای گەورەش زاناترە .

لە ﴿صەحیحی موسلیم﴾دا هاتووە لە عبدالله كوڕی شقیق ئەگێڕێتەوە ، ئەویش لە ئەبو هورەیرە لەبارەی چۆنیەتی دەرچوونی گیانی بڕواداران ئەگێڕێتەوە و ئەڵێت : «پاشان بۆ لای خوای گەورە بەرز ئەكرێتەوە، ئەوسا سەبارەت بە بڕوادار ئەڵێن : بیگەڕێننەوە بۆ "سدرة المنتهی" ، هەروەها لەبارەی گیانی بێباوەڕیش ئەڵێن : بیبەنە "سجین"» ، هەمان شێوەشی لەباسی گیانی بێباوەڕ باس كرد ، تیایدا هاتوە : كاتێك پێغەمبەر (ﷺ) باسی بۆنە ناخۆشەكەی گیانی بێباوەڕ ئەكات پارچە قوماشێكی تەنكی لەسەر دەمی دانابوو .

ئیبن ئەبو دنیا لە فەرموودەی قەتادە دەریهێناوە ئەویش لە (قسامە)ی كوڕی زوهیر ئەگێڕێتەوە ، ئەویش لە ئەبو هورەیرە ئەگێڕێتەوە و ئەڵێـت : پێغەمبەر (ﷺ) ئەفەرموێت : «كاتێك بڕوادار ئەگاتە سەرەمەگ فریشتە دێنە لای كە قوماشێكی حەریریان پێیە لەناویدا میسك و هەندێك ڕێحانەی لەناودابوو ، پاشان وەكو چۆن موێك لەناو هەویر ئەهێننە دەرەوە وەها گیانی بە ئاسانی ئەكێشن و پێی ئەڵێن : ئەی گیانی دامەزراو "لەسەر فەرمانەكانی خوای گەورە" وەرە دەرەوە لەناو لاشەكەت ، ڕەزامەند بووی لەسەر هەموو ئەو فەرمانانەی خوای گەورە لەسەری دانابوی ، بەهەمان شێوە خوای گەورەش لە تۆ ڕازییە ، وەرە دەرەوە بۆ لای ڕەزامەندی خوای گەورە ،ئەوسا كاتێك گیانەكەی دێتەدەرەوە لەناو ئەو پارچە قوماشەی كە میسك و ڕێحانەی تێدایە دایئەنێن و پاشان بەنەرمی ئەیپێچنەوە ، و بەرزی ئەكەنەوە بۆ (أعلی علیین) . هەروەها كاتێكیش بێباوەڕ دێتە سەرەمەگ ، ئەوا فریشتەی گیانكێشان دێنە لای پارچەیەكیان پێیە كە پشكۆیەك ئاگری بەهێزی لەناو دایە ، پاشان زۆر بە ناخۆشی گیانەكەی ئەكێشن ، دوایی پێی

ئەڵێن : وەرە دەرەوە ئەی گیانی پیسی لە ڕێ دەرچوو، خوای گەورە لێت ڕەنجاوە ، وەرە دەرەوە بۆ ناو سزای خوای گەورە ، ئەوسا ئەگەر هاتە دەرەوە ئەوا لەسەر ئەم پشکۆ ئاگرەی ئامادەیان کردوە دایئەنێن ، کە دایئەنێن دەنگی قرچانەوەی دێت ، پاشان پارچەکە ئەپێچنەوە و ئەیبەنە ئەو شوێنەی کە بۆی ئامادە کراوە لە (سجین) .

هەندێك لە زانایان ئەڵێن : گیانی نەوەکانی ئادەم لەو شوێنەیە کە ئادەمی لێیە ، کەوتۆتە لای ڕاست و چەپی باوکە ئادەم ، بەڵگەش بۆ ئەمە ، ئەم فەرموودەیەی ئەنەسە کە لە باوکی ذر (خوای لێیان رازی بێت) گێراویەتیەوە ، ئەویش لە پێغەمبەر (ﷺ) ئەگێرێتەوە و ئەڵێت : «سەقفی ماڵەکەم کرایەوە لەو کاتەی کەلە مەککە بووم» ئینجا فەرموودەکەی بەدرێژی باس کرد ، تیایدا هاتوە : «کاتێك ئاسمانی دنیا کرایەوە پیاوێکم بە دانیشتنەوە بینی خەڵکێکی زۆری لەلای ڕاست و چەپەی بوون ، ئینجا هەر کاتێك سەیری لای ڕاستەی بکردبایە ئەوا پێئەکەنی ، بەڵام لەوکاتەی کە تەماشای لای چەپی ئەکرد ئەگریا ، کاتێك منیشی بینی وتی : بەخێربێیت ئەی پێغەمبەر و کوڕی چاك "صالح" . کاتێك ئێمەش ڕۆیشتین منیش بە جبرائیلم وت : ئەم کەسە دانیشتوە کێ بوو ؟ ئەویش وتی : ئەمە ئادەم بوو ، هەروەها ئەم خەڵکەی لای ڕاست و چەپیش نەوەی ئادەمن . لای ڕاست ئەوانەن کە ئەڕۆنە بەهەشت ، بەڵام ئەوەی لای چەپ خەڵکی دۆزەخن ، هەربۆیە کاتێك سەیری لای ڕاست ئەکات پێئەکەنێ ئەیگرێت ، بەڵام لەوکاتەی تەماشای لای چەپ ئەکات ئەوا ئەگرییێت ...» و بەدرێژی باسی فەرموودەکەی کرد . {بوخاری و موسلیم گێراویتیەوە}

.

لەڕاستیدا لە دەربڕینی ئاشکرای ئەم ووشانەوە دەرئەکەوێت کە گیانی بێباوەڕان وا لە ئاسماندایە، کە ئەمەش پێچەوانەی ئەم فەرموودەیەی خوای گەورەیە کە ئەفەرموێت : ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ كَذَّبُوا۟ بِـَٔايَـٰتِنَا وَٱسْتَكْبَرُوا۟ عَنْهَا لَا تُفَتَّحُ لَهُمْ أَبْوَٰبُ ٱلسَّمَآءِ ... \ واتە : بێگومان ئەوانەی بڕوایان بە ئایەت و فەرمانەکانی ئێمە نەهێناوە و خۆیان لە ئاستیدا بەگەورە داناوە ، ئەوانە دەروازەکانی ئاسمانیان بۆ ناکرێتەوە ... ﴾ ﴿الأعراف: ٤٠﴾ . هەروەها پێچەوانەی فەرموودەی بەراء و ئەبو

هورەیرە و جگە لەوانیشە، لەوەی کە ئاسمان بۆ گیانی بێباوەڕان ناکرێتەوە ، سەرەڕای ئەمەش پێغەمبەر (ﷺ) لەمبارەیەوە ئەم ئایەتەی خوێندەوە کە خوای گەورە ئەفەرموێت : ﴿ ...وَمَن يُشْرِكْ بِٱللَّهِ فَكَأَنَّمَا خَرَّ مِنَ ٱلسَّمَآءِ فَتَخْطَفُهُ ٱلطَّيْرُ أَوْ تَهْوِى بِهِ ٱلرِّيحُ فِى مَكَانٍ سَحِيقٍ \ واتە : ... جا ئەوەی هاوەڵ و شەریك بۆ خوا بڕیار بدات ، وەکو ئەوە وایە لە ئاسمانەوە بەر ببێتەوە و باڵندە پەلاماری بدات و (پارچە پارچەی بکات) یاخود ڕەشەبایەکی بەهێز بیفڕێنێت و بیبات بۆ شوێنێکی دوور و قوڵ . ﴾ ﴿الحج: ٣١﴾ .

هەندێك لە زانایان بەمشێوەیە ڕاڤەیان کردوە کە ئەو گیانانەی لە لای ڕاست و چەپەی ئادەمن ئەوا گیانی ئەو بڕوادارانەیە کە تاوانیان ئەنجام داوە . هەروەها هەندێك لە زانایانیش بەمشێوەیە لێکیان داوەتەوە لەوەی ئەمانە گیانی ئەو نەوانەی باوکە ئادەمن کە هێشتا لاشەیان بۆ دروست نەکراوە . ئەمە لە ئەوپەڕی دووریەوەیە لە تێگەیشتن ، سەرەڕای ئەوەی پێچەوانەی ڕای هەندێك لە زانایانیشە لەبارەی دروست بوونی گیان پێش لاشەکەی .

ئەو فەرموودەیەی ئەبو هورەیرە لەمەوپاش کە باسی لێوە ئەکەین هەموو ئەم دژایەتیەی دەق و تێگەیشتن لائەبات و هەمووی بەتەواوی ڕوون ئەکاتەوە، ئەویش ئەم فەرموودەیەیە لە گێڕانەوەی باوکی جعفری رازی ، کە لە ڕەبیع کوری ئەنەسی ئەبو عالیە ، یان جگە لەو ئەگێڕێتەوە ، ئەویش لە ئەبو هورەیرە ئەگێڕێتەوە ، بەدرێژی فەرمودەی شەوڕەوی "ألإسراء" باس ئەکات تا ئەگاتە ئەو شوێنەی کە ئەفەرموێت (ﷺ) : «پاشان بەرزیان کردەوە بۆ ئاسمانی دنیا ، جبرائیل داوای کردنەوەی دەرگای ئاسمانی کرد ، فریشتەکانی دەرگاوانی ئاسمانیش وتیان : ئەمە کێیە ؟ وتی : جبرائیلە . وتیان : کێت لەگەڵە ؟ وتی : محمد . ئەوانیش وتیان : بۆ ئایا محمد ئێستا نێردراوە "بۆتە پێغەمبەر" ؟ وتی : بەڵێ . وتیان : سەلامی خوا لە برا و جێنشین بێت ، بەڕاستی باشترین برا ، هەروەها باشترین جێنشینە ، و باشترین میوانیشە کە هاتبێت. وتیشی : ئینجا، کاتێك چونە ژوورەوە پیاوێکی زۆر خوڕەوشت بەرزیان بینی کە هەموو ڕوشتێکی بەرزی هەبوو ، لای ڕاستی ئەم پیاوە دەرگایەکی لێبوو بۆنێکی خۆشی لێوە ئەهاتە دەرەوە ، هەروەها لەلای

چەپەشی دەرگایەکی لێبوو بۆنێکی ناخۆشی لێوە ئەهاتە دەرەوە ، ئنجا هەرکاتێکیش سەیری لای ڕاستەی بکردبایە ئەوا پێئەکەنی و دڵی خۆش ئەبوو ، بەڵام کاتێکیش تەماشای لای چەپی ئەکرد ئەگریا و خەمبار ئەبوو . بۆیە پێغەمبەریش (ﷺ) وتی : ئەی جبرائیل ئەم پیاوە پیرە ڕەوشت بەرزە کێیە ، کە هەموو ڕەوشت بەرزیەکی تێدا کۆبۆتەوە ؟ هەروەها ئەم دوو دەرگایانەی لای ڕاستە و چەپی چیە ؟ ئەویش وتی : ئەمە باوکی تۆیە ئادەم (عليه السلام) . دەرگای لای ڕاستیش ، دەرگای بەهەشتە ، بۆیە هەرکاتێك سەیری لای ڕاست ئەکات و ئەبینێت یەکێك لە نەوەکانی لەوێ ئەچێتە ژوورەوە ئەوا پێئەکەنێت و دڵخۆش ئەبێت . هەروەها ئەم دەرگایەی لای چەپەشی دەرگای دۆزەخە ، بۆیە هەرکاتێکیش ئەبینێت یەکێك لە نەوەکانی ئەچێتە ناو دۆزەخ ئەگرێت و خەمبار ئەبێت» . پاشان هەموو فەرمودەکە باس ئەکات . ئەم فەرمودەیە بەزار بەتەواوی لە"مسند"دکەی تۆماری کردوە ، و دەریهێناوە ، هەروەها ئەبوبەکر خەلال و جگە لەویش باسیان لەم فەرموودەیە کردوە . بەڕاشکاوی تیایدا هاتوە کە گیانی نەوەکانی ئادەم لەناو بەهەشت و دۆزەخ دایە ، کە باوکە ئادەم لە لای ڕاستیەوە لە دەرگای بەهەشت سەیری خەڵکی بەهەشت ئەکات ، بەهەمان شێوە لەلای چەپییەوە لە دەرگای دۆزەخ تەماشای خەلکی ناو دۆزەخ ئەکات ، ئەمە ئەوە ناگەیەنێت کە بەهەشت و دۆزەخ لە ئاسمانی دنیادان ، بەڵکو واتاکەی ئەمەیە کە ئادەم لە ئاسمانی دنیادایە، دەرگای بەهەشت و دۆزەخ ی بۆ کراونەتەوە تاوەکو لەڕێگەیەوە سەیری گیانی نەوەکانی بکات کە ئەچنە ئەم دوو شوێنە .

بەهەمان شێوە پێغەمبەر (ﷺ) لەکاتی ئەنجام دانی نوێژی خۆر گیران بەهەشت و دۆزەخی بینیوە . لەکاتێکدا لەسەر زەوی هێشتا هەر لە ژیاندا بووە ، خۆ بەهەشت لەسەر زەوی نیە . ئەگێڕنەوە لە شەوی شەوڕەوی "ألإسراء" دا دۆزەخی لە ئاسمان بینیوە ، لەکاتێکدا دۆزەخ لە ئاسمانیش نیە .

* * *

# بەشی دەیەم

# تەسکی و تاریکی گۆڕ و ڕووناك بونەوەی بەهۆی نزای موسڵمانانی زیندوو

لـە بەشی دووەم بـاسمان کرد کە گۆڕ ئەڵێت : خانووی تاریکیم ، ماڵێکـی تەسك و تەنگم ، تەنهـا بـۆ ئەوانە نـەبێت کـە خـوای گەورە بۆیان فراوان ئەکات .

ئیبن موبارەکیش ئەڵێت : صفوان ی عەمر بۆی باس کردین ، ئەویش ئەڵێت : سلیم کوری عامر بۆی باس کردین وئەڵێت : شوێن مردوێك کەتین بۆ ئەوەی بیبەینە گۆرستان ، لەوکاتەش ئەبو (امامه الباهلی)مان لەگەڵ بوو، دوای ئەوەی نوێژی لەسەر کرد ، و ناشتیان , ئەبو ئومامە وتی : ئێوە لەماڵێکدا ڕۆژتان کردەوە و شەویشتان بەسەرداهات و ژیانتان تێدا بەسەر برد ، چاکە و خراپەتان تێدا ئەنجام داوە . لەراستیدا خەریکە بارگەتان بپێچنەوە و بڕۆن بەرەو ماڵێکی دیکە ، ئەویش ئەمەیە "لەوکاتەش ئاماژەی بۆ گۆڕەکە ئەکرد" هەروەها وتیشی: ماڵی تەنهایی ، ماڵی تەسك و تاریکی ، ماڵی سزاو ئازاردانە ، تەنها بۆ ئەو کەسانە نەبێت کە خوای گەورە بە میهرەبانی لەگەڵیان بجوڵێتەوە و بۆیان فراوان بکات و بیکاتە مێرگێك لە مێرگەکانی بەهەشت ، پاشان لە ڕۆژی زیندووبوونەوەدا ئەچنە گۆڕەپانی لێپرسینەوە و دادگای خوای گەورە .

ئیبن ئەبو دنیا بەسەنەدەوە لە ژنی هیشامی (الدستوائی) ئەگێڕێتەوە و ئەڵێت : هیشام عادەتی وەهابو کاتێك لەشەودا چراکە خامۆش بوبا ڕەنگی تێك ئەچو و بارودۆخی بەرەو خراپی ئەچو ، منیش جارێکیان پێموت : ئەی هشام ، بارودۆخت زۆر تێك ئەچێت کاتێك چراکە خامۆش ئەبێت ، ئەویش وتی : لەکاتی خامۆش بوونی چراکە تاریکی نێو گۆڕم بیر ئەکەوێتەوە ، پاشان وتی : ئەگەر هاتو یەکێك لە پێش من بچێتە ئەوێ ئەوا پێم ئەوتن ئەم چرایە لە لایەکی خانوەکەم "گۆرەکەم" دابنێن . بەڵام هێندەی پێنەچو کە مرد . پاشان گێڕەرەوە ئەڵێت : هەندێك لەهاوەڵەکانی جارێکیان بەنزیك گۆڕەکەی گوزەریان کرد و وتیان : ئەی ئەبوبەکر گەڕایتەوە لای خوای گەورە .

حسن كوڕى بەراء ئەڵێت : عبدالواحد كوڕى غياث بۆى گێرامەوە ، (جمعە) كە هاوسێ ی ماڵى هشام (الفردوسى) بوو، گێرايەوە و ئەڵێت : هەركاتێك هشام بەشدارى كردبا لە ناشتنى مردوێك و پاشان كە ئەگەرايەوە ماڵەوە نانى ئێوارەى نەئەخوارد، هەروەها لە شەويشدا لە ژوورێكدا نەئەخەوت كە تاريك و بێ چرا و ڕووناكى بوايە ، وتيشى : شەوێكيان چراى ژوورەكەى كوژايەوە ، بۆيە هشاميش بارودۆخى تێك چوو يەكسەر ڕايكردە دەرەوە ، بۆيە ئەوانەى لە ژوورەوە بوون پێيان وت : بۆچى شڵەژاوى و ڕاتكردە دەرەوە ؟ هەميشە وتى : تاريكى نێو گۆڕم بەبير هاتەوە .

ئيبن ئەبو دنيا بەسەنەدەوە لە (وهەيب كوڕى وەرد) ئەگێڕێتەوە و ئەڵێت : ڕۆژێكيان كوڕى (مطيع) سەيرى خانووەكەى ئەكات ، جوانيەكەى زۆر سەرنجى ڕائەكێشێت ، بۆيە ئەگريێت ، و ئەڵێت : سوێند بەخوا ئەگەر مردن و تاريكى نێو گۆڕ نەبوايە ، ئەوا دڵم زۆر پێت خۆش ئەبوو ، دنياش گلينەى چاوەكانم ئەبو ، پاشان زۆر بە توندى گريا بەشێوەيەك كە دەنگى گريانەكەى بەرز ئەبوەوە .

هەروەها بەسەنەدەوە ئەگێڕێتەوە لە (فيض)ى كوڕى ئيسحاق ، و ئەڵێت : فضيل كوڕى عياض پێى وتم : ئايا ئەگەر دنيا هەموى موڵكى تۆ بوايە ، دواتر پێتبڵێن : وازبهێنە لە موڵكى دنيا ، لەبەرامبەردا سزاو ئازارى گۆڕت لەسەر هەڵئەگيرێت و بۆشت فراوان ئەكرێت . ئايا تۆ چى ئەڵێيت ؟ هەروەها وتيشى : بيربكەوە ئايا تۆ نامريت و كەس وكار و ، ماڵى دنيات بەجێ ناهێڵێت ، وەكو هەمو كەسێك ناڕۆيتە ناو گۆڕ و بەتەنهايى لەناو گۆڕێكى تەسك و تاريك دا نامێنيتەوە ، پاشان ئەم ئايەتەى خوێندەوە : ﴿ فَمَا لَهُۥ مِن قُوَّةٍ وَلَا نَاصِرٍ ﴾ واتە : ئادەميزاد هيچ هێز و پشتيوانيەكى نيە ﴿ الطارق: ١٠﴾ . دواتر وتى : ئەگەر تۆ هەمو ماڵى دنيات نەگۆڕيتەوە لە بەرامبەر هەڵگيرانى سزا و ئازارى نێو گۆڕ و هەروەها فراوانكردنيشى ، ئەگەر ئەم كارە نەكەيت ئەوا لەهەمو بونەوەرانى سەر زەوى بێ هۆشترى.

ئەڵێت : محمد کوری حسین هەواڵی پێداین ، ئەویش ئەڵێت : محمد کوری حەربی مەکی بۆی گێرامەوە و وتی : ئەبو عبدالرحمن ی معمری خواپەرست لە شاری مەککەدا سەردانی ئێمەی کرد ، پاش پشوودان لەدەوری کۆبوینەوە ، هەروەها پیاوماقوڵانی شاری مەکەش هاتنە لای. وتی : کاتێك ئەبو عبدالرحمن سەری بەرزکردەوە و بینا بەرزەکانی چواردەورەی کەعبەی بینی ، بە دەنگێکی بەرز بانگی کردو وتی : ئەی خاوەن بینا بەرزەکان ، تاریکی و تەنهایی نێو گۆڕ بەبیر خۆتان بهێننەوە . ئەی ئەوانەی کە حەز لە خۆشی و چێژ وەرگرتن ئەکەن بیری کرم و کێم و زوخاو و رزینی لاشەی خۆتان بکەن لەناو گۆڕدا ، وتی : پاشان چاوەکانی داخست و خەوت .

هەروەها لە پەرتوکی (العزلة) دا ئەڵێت : حسین کوری عبدالرحمن ئەگێڕێتەوە لە پیاوێك کە ئەڵێت : لە مەصیصە چومە ماڵی پیاوێك و سەردانم کرد ، بینیم ئەسپ و پێخوری (علف)ی ئەسپەکەش و بەخۆش ی لە یەك شوێن نیشتەجێن و هیچ پەردەیەك یاخود دیوارێکی ئەوتۆ لەنێوانیان دا نیە کە شایانی باس کردن بێت ، بۆیە پێموت : ئایا هەمو بەیەکەوە لە ژورێکدان شوێنت تەسك نیە و چۆن ژیان بەسەر ئەبەیت لەکاتێکدا توانای ئەوەت هەیە شوێنێکی دیکە بۆ ئەسپ و پێخورەکەی دابین بکەی ؟ بۆیە پیاوەکەش گریا ، پاشان وتی : هەرکاتێك تەسکی و تاریکی ، هەروەها تەنهایی و ناخۆشی ناو گۆڕم بیرئەکەوێتەوە ئەم شوێنە تەسك و ناخۆشەی خۆم زۆر بە فراوان دێتە پێش چاو و هەمو ناخۆشیەکانم لەبیر ئەچێتەوە .

❊ ❊ ❊

## ووچانێك

ئیبن ئەبو دنیا لەرێگای (غطفان المزي) ئەگێڕێتەوە و ئەڵێت : عمر(ﷺ) وتی: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەگەر هەندێك ڕووبەڕووی ترسێك ببینەوە لەوانەیە رزگارمان ببێت لێی ، بەڵام ئاخۆ چۆن ڕزگارمان ئەبێت لە تاریکی و ناخۆشیەکانی نێو گۆڕ ؟ پێغەمبەریش (ﷺ) فەرمووی : «لەڕاستیدا بەندە لەسەر ئەو بیروباوەڕەی هەیبوە لە ژیاندا و لەسەری مردوە زیندو

ئەکرێتەوە ، واتە : ئەمە لەهانایەوە دێت» (ئەمە فەرموودەیەکی مەسل)ە . {موسلیم گێراویەتیەوە} .

بەسەنەدەوە لە وەهەبی کوڕی (منبە) ئەگێرێتەوە , و ئەڵێت : جارێکیان عیسی (عليه السلام) لەگەڵ حەواریەکان لەسەر گۆڕێك وەستابوون ، هاوەڵی مردوەکەش بەخراپە باسی مردوەکەی ئەکرد ، بۆیە ئامادەبوانیش ناخۆشی و تەنگ و تاریکی نێو گۆڕیان بەبیرهێنایەوە ، هەروەها "عیسی"ش (عليه السلام) وتی : سەبارەت بەم مردوە ئەوا ئێوە لەشوێنێکی ناخۆشتر و تەنگتر دابوون پێش ئەوەی بێنە ناو ژیانی دنیا ، چونکە ئێوە لەناو سکی دایکتان بوون ، خۆ ئەگەر خوای گەورە (جل جلاله) یەکێکی خۆشویست و ویستی نیعمەتی بەسەردا برژێنێت و بۆی فراوان بکات ئەوە جێبەجێی ئەکات .

بەسەنەدەوە لە جعفری کوری سلیمان ئەگێرێتەوە ، و ئەڵێت : پیاوێکی مردووم لەنێو گۆڕەکەی دا بینی ، ئەویش وتی : ئەو کەسەی کە خاوەن تواناو دەسەڵاتە و ئەتوانێت ئەو شوێنە تەسکەی کۆرپەلە ، لەناو سکی دایکی دا و پاشان بۆی ئاسان ئەکات و شوێنێکی فراوانتری پێ ئەبەخشێت و ئەیهێنێتە سەر دنیا ، ئەوە بەتواناشە لەوەی ئەم گۆڕە تەسکەی بۆ فراوان بکات . وتی : هەندێك ئەڵێن : ئەمە (شبیل کوڕی عەزرە) بو ئەم قسەیەی ووتوە .

پێشەوا ئەحمەد لە فەرموودەی ئەنەس دەریهێناوە ، ئەڵێت : ئەو ڕیشپێستەی مزگەوتی پێغەمبەری خاوێن ئەکردەوە ، لە شەودا کۆچی دوایی ئەکات ، لەو کاتەش پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بەمردنەکەی نازانێت ، خەڵکەکەش هەر بەم شەوەی کە ئەم هاوەڵە تێیدا کۆچی دوایی کردوە ئەیبەنە سەر گۆرستان و ئەینێژن , پاش ناشتنەکەی ئینجا هەواڵ ئەدرێتە پێغەمبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) ، بۆیە پێغەمبەریش (صلى الله عليه وسلم) یەکسەر ئەفەرموویت : بابچینە سەر گۆڕەکەی ، هەروەها فەرمووشی : لەڕاستیدا گۆڕ ماڵێکی زۆر تاریکە لەسەر هاونشینانی، خوای گەورەش (جل جلاله) بەهۆی نوێژکردنی من لەسەری بۆی ڕووناك ئەکاتەوە ، پاشان چوە سەر گۆڕەکەی و نوێژی لەسەر کرد . (مەبەست لەمە نزاو پاڕانەوەیە بۆ مردوەکە) .

محمد کوری حومەیدی رازی ، لە کوری بەریدە ، ئەویش لە باوکیەوە ئەگێڕێتەوە : جارێکیان پێغەمبەری خوا (ﷺ) بەهاوڕێیەتی (ئەبوبەکر و عمر) بەنزیك گۆڕێك دا ڕۆیشتن کە ماوەیکی کەم بوو مردویان تێدا ناشتبوو ، بۆیە پێغەمبەریش (ﷺ) فەرمووی : «ئەم گۆڕە هی کێیە ؟» ئەبوبەکر وتی : ئەی پێغەمبەری خوا ئەمە هی (أم محجن)ە , لەژیانیدا عادەتی وەهابو بەردەوام مزگەوتی پاك ئەکردەوە . فەرموی : «ئایا بۆچی لەو کاتەدا ، کەتازە مردبو پێش ئەوەی بینێژن هەواڵی مردنەکە و پێ نەوتم» ئەوانیش وتیان : لەوکاتەدا تۆ خەوتبوی پێمان ناخۆش بوو ئاگادارت بکەینەوە . بۆیە ئەویش فەرموی : «جارێکی تر ئەمە مەکەن ، چونکە نوێژ کردنی من لەسەر مردوەکانتان ، ئەبێتە هۆی ڕووناك بونەوەی گۆڕەکانیان» . وتی : دواتر هاوەڵەکانی ریزکردن و پاشان بەیەکەوە نوێژیان لەسەر کرد . {بەیهەقی گێراویەتیەوە ، سەنەدەکەشی حسن}ە.

لە ڕابردودا باسی ئەوەمان کرد لەوەی کە ئەبو (قلابە) ئەگێڕێتەوە ، جارێکیان مردوێکی لەخەودا بینی ، و مردوەکە پێی وت : خوای گەورە پاداشتی چاکەی خەڵکی دنیا بداتەوە ، لەجیاتی من سەلامی خوایان پێبگەیەنە ، چونکە بەهۆی نزا و پاڕانەوەی ئەوان بۆ ئێمە گۆڕەکەمان ڕووناك بۆتەوە ، وەکو چیایەکان نوور و ڕووناکی دێتە ناو گۆڕەکانمان .

ئیبن ئەبو دنیا ئەڵێت : ئەبو عبداللە کوڕی بجیر بۆی گێراینەوە و وتی : هەندێك لە هاوەڵانم بۆی گێرامەوە و وتی : یەکێك لە براکانم مرد ، پاش مردنەکەی لەخەوما بینیم ، منیش پێموت : ئایا نزاو پاڕانەوەی زیندوان بە ئێوە ئەگات ؟ ئەویش وتی : بەڵێ سوێند بەخوا ، هەموو چواردەورەمان ڕووناك ئەکاتەوە ، چونکە وەکو ڕووناکی و نوور بەدوای یەکدا ڕیز ئەبەستن و دێنە ژوور و ئێمەش ئەیان پۆشین .

بەسەنەدەوە لە بەشاری کوری غالبی بەحرانی ئەگێڕێتەوە و ئەڵێت : ڕابعەی عەدەویەم لەخەودا بینی پاش کۆچی دواییەکەی ، هەموو جار عادەتم وەهابوو دوعای زۆرم بۆئەکرد ، لەخەوما پێی وتم : ئەی بەشار کوڕی غالب هەدیەکانی تۆ لەشێوەی پارچەی ڕووناکی بە ئێمە ئەگەن کە بە قوماشی حەریر داپۆشراون . منیش وتم : ئەمە چۆن ؟ ئەویش وتی : بەمجۆرە کاتێك زیندوان دوعا بۆ مردوان ئەکەن وە لێیان وەرئەگیرێت ، ئەوە ئەم دوعایانە لەشێوەی پارچەی نوور و

ڕووناکی ئامادە ئەکرێن و پاشان بە پارچەیەك قوماشی حەریر دائەپۆشرێن، و دواتر بۆ ئەو مردوە ئەنێردرێت کە دوعاکەی بۆ کراوە ، پێشی ئەڵێن : ئەمە هەدیەی فلاَنە کەسە و بۆ تۆی ناردوە .

بە سەنەدەوە لە بشری کوری منصور ئەگێڕێتەوە و ئەڵێت : پیاوێك لە زەمانی بلاَوبونەوەی نەخۆشی تاعون ، بەشداری نوێژی مردوانی ئەکرد ، کاتێکیش ئێوارە دائەهات ئەچوە بەر دەرگای گۆڕستان و ئەیوت : لەم تـەنـهـایـیـەتانـدا خـوای گەورە ببێتە هاودەم و هاونشین، بە میهرەبانی خۆی لەم غوربەتەدا لـەگـەڵتان بجوڵێتەوە ، لـە تاوانەکان و خۆش ببێت و چاکەکانیشتان وەربگرێت . (هەمو ئێوارەیەك لەم ووشانەی زیاتر نەئەووت) . ووتی : ئێوارەیەکیان شەوەکەی نەچومە سەر گۆڕستان ، بەڵکو چومەوە ماڵەوە ، و دوعاکانم نەخوێند ، کاتێك شەوەکەی خەوتم لەوخەما خەڵکێکی زۆر هاتنەلام ، منیش وتم : ئێوە کێن و بۆچی هاتونە ؟ ئەوانیش وتیان : ئێمە خەڵکی گۆڕستانین . وتم : ئەی بۆچی هاتونە ؟ ئەوانیش وتیان : ئەو هەدیەی هەمو جارێك بۆ ئێمەت ئەنارد ئیمڕۆ ئێمەت لەبەر خێزانەکەت لەبیر کردوە ، هەدیەکەت نەناردوە . منیش وتم : کامەیە ؟ وتیان : ئەو دوعایانەی هەموو ڕۆژێك لەبەر خوا پێی ئەپاڕایەوە . وتی : بۆیە منیش وتم : ئەگەڕێمەوە سەری و دوعایەکان ئەکەم . (ئەوسا لەو کاتە بەدواوە وازم لێنەهێناوە) .

بە سەنەدەوە لەسوفیان کوری عویەینە ئەگێڕێتەوە ، و ئەڵێت : هەموو جارێك ئەیوت : مردوەکان ئەوەندە پێویستیان بە دوعا کردنە ، کە زۆر زیاترە لە پێویستی زیندوان بە خۆراك و ئاو.

هەروەها بە سەنەدەوە لە هەندێك لە پێشینان (المتقدمين) ئەگێڕێتەوە ، و ئەڵێت : بە گۆڕستانێك دا ڕۆیشتم، و بەزەییم بە بارودۆخیان داهاتەوە و دوعام بۆ کردن، ڕاستەوخۆ بانگکەرێك لە غەیبەوە بانگی لێکردم و ، وتی : بەڵێ ، بەزەییت بە بارودۆخیان دا بێتەوە، چونکە غەمبار و پەشۆکاو و حاڵ خراپی زۆریان تێدایە .

* * *

موسلیم لە صەحیحەكەیدا لە فەرمودەی (بەریدە) دەریهێناوە ، ئەویش لە پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەگێڕێتەوە , كە ئەفەرموێت : «جاران ڕێگەم بە ئێوە نەئەدا سەردانی مردوەكانتان بكەن ، بەڵام ئێستا سەردانیان بكەن چونكە ڕۆژی زیندوبونەوەتان بەبیر ئەهێنێتەوە» . {موسلیم گێڕاویتیەوە} . پێشەوا ئەحمەدیش بەشێوەكی دیكە دەریهێناوە : «چونكە پەند و ئامۆژگاری لە سەردانی مردوان وەرئەگرن» .

ئیبن ماجە لە فەرمودەی ئیبن مەسعود دەریهێناوە ، كە پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەفەرموێت : «سەردانی مرودەكانتان بكەن ، چونكە دنیاتان لەبیر ئەباتەوە , و دوارۆژتان بیرئەخاتەوە» . {حاكم گێڕاویتیەوە ، و ئەڵێت : صحیح علی شرط مسلم} .

پێشەوا ئەحمەد لە فەرمودەی ئەنەس دەریهێناوە كە ، پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەفەرموێت : «جاران ڕێگەم بەئێوە نەئەدا سەردانی مردوانتان بكەن ، بەڵام ئێستا بۆم دەركەوتوە ئەبێتە هۆی دڵ نەرم بوون ، و چاوەكان فرمێسكیان پێدا دێتە خوارێ ، ڕۆژی زیندوبونەوەشتان بیر ئەهێنێتەوە ، بۆیە ئێستا سەردانیان بكەن ، مەڵێن : وازمان لە ئێوە هێناوە» . {حاكم گێڕاویتیەوە} .

موسلیم دەریهێناوە ، لە فەرمودەی ئەبو هورەیرە ، كە پێغەمبەر (ﷺ) ئەفەرموێت : «داوام لە خوای گەورە (ﷻ) كرد لەوەی كە ڕێگەم پێبدات سەردانی گۆڕی دایكم بكەم ، ئەویش ڕێگەی دام ، بۆیە ئێوەش سەردانی مردوەكانتان بكەن چونكە مردن و بەبیر ئەهێنێتەوە» . {موسلیم گێڕاویەتیەوە} .

ئیبن ئەبو دنیا بەسەنەدەوە لە عمر كوری عبدالعزیز ئەگێڕێتەوە ، لەوەی جارێكیان بۆ ناشتنی مردوێك چوە دەرەوە ، دوای ئەوەی مردوەكەیان ناشت ، عمر وتیە هاوەڵەكانی : وازم لێ بهێنن تاوەكو سەردانی گۆڕی خۆشەویستان ئەكەم . ئینجا وتی : پاش ماوەیەك چوە لایان ، ئەمەش وای لە عومەر كرد بگرییێت و لەبەر خوای گەورەش بپاڕایەوە . لەو كاتەش لەنێو خاك دا بانگكەرێك بانگی كرد و وتی : ئەی عومەر لێم مەپرسە چیم لە خۆشەویستان كردوە ؟ عمریش

ووتی : چیت لێکردوون ؟ وتی: کفنەکەیانم لیّ ڕزاندن ، گۆشتەکەیانم خوارد ، هەموو لاشەی ئەوانم لێك هەڵوەشاندەوە ، دەستم لەباسك کردەوە ، باسکم لەقۆڵ کردەوە ، قۆڵم لە شان و، شانم لە برِبڕە کردەوە ، پێیەکانم لە لاق و ، لاقم لە ڕان کردەوە ، هەروەها ڕانم لە لاشە کردەوە ، بەمجۆرە هەموو لاشەیانم لەبەریەك هەڵوەشاندەوە، وتی : لەوکاتەش عومەر هەر ئەگریا ، بەڵام پاش ئەوەی ویستی هەستێتە سەر پێ ، خاکیش پێیوت : ئایا پێتبڵێم : چ شتێك ئەبێتە هۆی ئەوەی کفن نەڕزێنێت ؟ ئەویش وتی: کامەیە ؟ خاکیش ووتی : پارێزگاری (واتە : تەقوا)ی خوا و ئەنجامدانی کردەوەی چاکە .

به سەنەدەوە ئەگێڕێتەوە لەوەی جارێکیان ئەبو دەرداء بە گۆڕستانێك دا ئەڕۆیشت ، لەهەمان کاتیش ئەیوت : ئەی گۆڕەکان ڕوکاری دەرەوەتان چەند هێمن و ئارامە ، بەڵام ناوەوەو چ کارەساتێکە .

دیسان بەسەنەدەوە لە مەیمون کوری مهران ئەگێڕێتەوە ، و ئەڵێت : جارێکیان لەگەڵ عومەری کوڕی عبدالعزیز چوم بۆ سەر گۆڕستان ، پاش ئەوەی گەیشتنە گۆڕستان، عومەر تەماشای گۆڕەکانی ئەکرد ، بۆیە دەستی بە گریان کرد ، دواتر ڕووی کردە مەیمون و پێیوت : ئەی ئەیوب ئەمانە گۆڕی باوانم نەوەی (ئومییە)ن ، وەکو ئەوە وان هەرگیز بەشداری خۆشی و لەززەتی دنیایان نەکردبێت ، پێشتر چەند لە خۆشی دا ئەژیان ، بەڵام ئێستا ئەبینی مردون و لەنێو گۆڕدان ، لاشەکانیان هەمو لێکهەڵوەشاوەتەوە ، لە چ بارودۆخێکی خراپ دان . پاشان عومەر بەشێوەیەك گریا تا لەهۆش خۆی چوو ، دوای ئەوەی بەهۆش خۆی هاتەوە، وتی: بابڕۆین، سوێند بەخوای گەورە (ﷻ) هیچ کەس نازانانێت لەوەی بە خۆشی ترین کەسێك ، ئەوانەن کە ئەچنە ناو گورِ ، و پاشان لە سزای خوای گەورە سەلامەت ئەبن .

لە هەندێك ئەعرابی ئەگێڕنەوە ، جارێکیان یەکێك لەسەر گۆڕستانێك وەستابو ، پاشان شیعرێکیان بەسەردا ئەهۆنێتەوە و ئەڵێت :

(هەموو خەڵکێك گۆڕێکی هەیە لە چۆڵەوانیدا
ئەوان کەم ئەبن و گۆڕەکان زیاد ئەکەن

هاکە ئەبینی ماڵێك ئاوەدانە ، پاشان چۆڵ ئەبێت

لەبەرامبەردا گۆڕێکی نوێ

لە شوێنێکی چۆڵدا دروست ئەکرێت

ئەوان هاوسێی زیندوانن

زۆر نزیکن لێیان

بەڵام ... هەرگیز بەیەك ناگەن) .

لە هەندێکیان ئەگێڕنەوە، جارێکیان لە گەشتێکیان دا بە گۆرستانێکی شارێك دا تێپیەڕیان کرد ، لەو کاتەش شیعرێکیان ئەوت:

(بەسیەتی غەم و پەژارە ، چونکە

بەهیچ شارێك دا نەڕۆیشتووم لە دەروازەکەی

گۆڕستانی لێ نەبێت) .

لە جعفەر کوڕی سلێمان ئەگێڕنەوە ، کە ئەڵێت : لە سەردەمی تێکشکانی گەورەدا ، لەگەڵ مالیکی کوڕی دینار ئەچوینە دەرەوە ، مردومان کۆئەکردنەوە ، ئامادەمان ئەکردن ، ئینجا کاتێك بەرەو گۆرستان بەڕێ ئەکەوتین ، مالکیش کە عەبایەکی بە خۆی دائەدا بەگوێدرێژێکی کورت ئەهات ، لەڕێگادا ئامۆژگاری ئێمەی ئەکرد ، هەتاوەکو ئەگەیشتینە گۆڕستان ، لەوێ لەسەر گۆڕستان بەدەنگێکی خەماوی ئەیوت :

(ئەی گەرەکی گۆرستان و خەڵکەکەی ، ئاگاداربن

خەڵکانێك لەناو خاکن وەڵامم بدەنەوە

خۆ ئەگەر گۆرەکان وەڵامی زیندوەکان بدەنەوە

ئەوا لە هەر سەردانێکم بۆلایان

وەڵامیان ئەدامەوە

بەڵام گۆڕەکان بێدەنگن ، خامۆش

بۆیە بەئاهو حەسرەت لەوەی لەلایان هەیە

ئەگەڕێمەوە ، هەر بەغەمباری) .

وتی: یەحیای کوڕی عبدالله پیاهەڵدانی ئەکردو ئەیوت : جارێکیان لەگەڵ عبدالله کوری جەعفەر کوری سلێمان "دەسەڵاتداری شاری بەسرا" دابوین ، لەوکاتەدا پیاوێك لەلامان تێپەڕی ، عادەتی وەهابوو ئامۆژگاری خەڵکی ئەکرد ، بۆیە (عبدالله)ش پێیوت: بە شیعرێك ئامۆژگاریمان بکە ، پیاوەکەش وتی:

(ئەگەر دەسەڵاتدار مرد ، چوە ناو گۆڕ

خۆ ئەگەر ...

گۆڕێکی جیاوازیشیان بۆ هەڵبەست

ئەوە

خاك ئەیرزێنێت و

سەیری گەورەیی دەسەڵاتەکەی ناکات) .

عبدالله ش لەسەرسامی ئەم شیعرەی گریا ، کوڕی سەماکیش شیعرێکی لەم شێوەی هەیە ، هەندێکی زیاترە کە ئەڵێت :

(مردن لەناو دەسەڵاتدارو هەژاران وەکو یەك بەدیار ئەکەوێت

هەروەها ...

لەخانووی قوڕ و کۆشك و تەلاری بەرزیش دا

جیاوازی ناکات) .

ئیبن ئەبو دنیا ئەڵێت : ئیسماعیل کوڕی عبدالله (العجلی) بۆی گێراینەوەو ئەڵێت : ئێمە لەسەر گۆڕستان بوین و پیاوێك ئەم شیعرەی وت :

(ئاگاداربن ، ئەی کۆمەڵانی زیندوو

ئەمانە هەموویان کۆمەڵی مردوانن

وەڵامی بانگەوازی بچووکیان داوەتەوە ، کە مردنە

بەڵام ، ئێستاکە ...

چاوەڕێی بانگەوازی گەورەن ، کە زیندوبونەوەیە

پێداگیری لەسەر زاد و توێشوو ئەکەن

بەڵام ، تەنها توێشووی تەقوار پارێزگاریە

لەهانایانەوە دێت

پێتان ئەڵێن :

خۆتان ماندوبکەن

کاری چاکە بکەن ، لەخوا بترسن

هاکا کتوپڕ ، دنیاتان بەکۆتا گەیشت) .

ئیبن ئەبو دنیا بە سەنەدەوە لـە سەلامی کوری صالح ئەگێڕێتەوە ، و ئەڵێت : ڕۆژێکیان حسن ماوەیەك دیار نەبوو، کاتێکیش ئێوارە داهات ، ئەویش هاتەوە ، هاوەڵەکانی پێیان وت: ئەمڕۆ لەکوێ بویت ، دیار نەبویت ؟ ئەویش وتی: ئەمڕۆ لەلای هەندێك لە براکانم بووم، ئەو برایانەی ئەگەر لە یادیان کەم بە بیرم ئەهێننەوە ، خۆ ئەگەر لەلایان نەبم ، ئەوا لە پاشملە باسم ناکەن "واتە غەیبەتم ناکەن و بە خراپە باسم ناکەن" هاوەڵەکانیش وتیانە حسن ی : سوێند بەخوا ئەمانە باشترین بران ، دە پێمان نیشان بدە . ئەویش وتی: خەڵکی گۆڕستانن و مردوەکانن.

بە سەنەدەوە لە عبدالواحد کوری زەید ئەگێڕێتەوە ، کە حسن بە هاوەڵەکانی وت، لەکاتێکدا لەناو گۆڕستان بوون : ئەم مردوانە خەڵکی شوێنێکن هەر کەس لەلایان دابنیشێت قسەو گوفتاری بۆ نایەت ، چونکە پێویستی پێی نیە ، هەروەها لە دانیشتن لەلایان پەندو ئامۆژگاری وەرئەگرێت .

بەسەنەدێکی پچڕ پچڕ (واتە : منقطع) ئەگێڕێتەوە ، جارێکیان بە (علی کوری ئەبو طالبیان (ﷺ) وت : ئایا بۆچی ماڵت لە هاوسێی گۆڕستانە ، و ئەم شوێنەت هەڵبژاردوە ؟ ئەویش وتی : من وای ئەبینم ئەمانە هاوسێی ڕاستگۆن ، زمانی خۆیان ئەگرن دوارۆژت بیر ئەخەنەوە .

بەسەنەدەوە لەعەماری دولی ئەگێڕێتەوە و ئەڵێت : جارێکیان محمد کوڕی واسع پێیوتم : خانوەکەت سەرنج ڕاکێشە و زۆرم بەدڵە ! . منیش وتم : چ شتێك لە خانووی من سەرنجی ڕاکێشاوی ، لە کاتێکدا لە نزیك گۆڕستانە ؟! ئەویش وتی : ئەمە هیچ نیە ، چونکە زیانیان بۆتۆ نیە ، هەروەها دوارۆژت بیر ئەخەنەوە .

بە سەنەدەوە لە مەیمون کوڕی مهران ئەگێڕێتەوە ، و ئەڵێت : ئەبو درداء (ﷺ) وتی : بۆ ئێوە لەم دوو ژیانەدا (واتە : ژیانی سەر دنیا و ناو گۆڕ) پەند و ئامۆژگاری هەیە ئەگەر بیری لێبکەنەوە ، چونکە ئێوە سەردانی مردوان ئەکەن ، بەڵام ئەوان سەردانی ئێوە ناکەن ، هەروەها ئێوە بۆ لای ئەوان ئەڕۆن ، بەڵام ئەوان بۆ لای ئێوە نایەن ، خەریکە سەر دنیا چۆڵ ببێت و گۆڕستانەکانیش پڕببن لە مردوان .

هەروەها بە سەنەدەوە لە (حسن)ی ئەگێڕێتەوە، و ئەڵێت : جارێکیان عثمان کوری ئەبو عاص ، ئەچوە سەر گۆڕستان بۆ ناشتنی مردوێك ، لەوێدا گۆڕێکی ڕۆچوی بینی ، بۆیە وتیە پیاوێك لە خزمەکانی : ئەی فلان وەرە تەماشای ماڵی خۆت بکە ، چ ماڵێکە . پیاوەکەش هات و وتی : ئەوە نابینم ماڵی من بێت ، چونکە هیچ خواردن و خواردنەوە و پۆشاکی تێدا نیە . ئەویش وتی : بەڵێ ، لە ڕاستیدا ئەمە ماڵی تۆیە . پیاوەکەش وتی : ڕاست ئەکەیت . وتی : پاشان پیاوەکە گەڕایەوە و وتی : سوێند بە خوای گەورە ، ئەبێت ئەم ماڵەم ، وەکو ماڵی سەر دنیا ئاوەدان بکەمەوە . حسن یش وتی : سوێند بەخوا ئەوە یان توند گرتنە ، یاخود بەهیلاك چونە . سوێند بە خوا یان ئارام ئەگرن لەسەر خواپەرستی ، یان بە هیلاك ئەچن .

لەگێڕانەوەیەکی دیکەدا هاتوە ، ئەڵێت : ماڵێکی تەسك و وشك و تاریك ، چۆڵە و هیچ خواردن خواردنەوە و ژنی لێ نیە ، من لەڕاستیدا خانووێکی ئاوەدانم بەجێ هێشتوە ، کە هەموو شتێکی هۆی حەسانەوە و پشوودانی تێدایە ، وەك خواردن و خواردنەوە و ژن . ئینجا (حسن)یش پێیوت: سوێند بەخوا ئەمە ماڵی تۆیە . پیاوەکەش وتی: سوێند بە خوا ئەگەر بگەڕابامەوە ئەوا ئێرەم هەڵئەبژارد .

لە كوڕي شوذب ئەگێڕنەوە ، كە ئەڵێت : جارێكيان ژنێك گۆڕێكي سەر والآ ئەبينێت ، بە ژنە هاوەڵەكەي ئەڵێت : ئەمە چيە ؟ (مەبەست لە ناو گۆڕەكەي بوو) . ژنەكەي ديكەش پێيوت : ئەمە سندوقي سپاردني كار و كردەوەكانە ، هەر كردەوەيەك لەسەر دنيادا بكەيت لێرە بۆت دائەنرێت .

ئەگێرنەوە جارێكيان حسن بەنزيك گۆڕێك دا ڕۆيشت ، ئينجا وتي : ئاي كە چەندە كۆمەڵێكي بێدەنگن ، چەند كەسي بارودۆخ خراپ و شێواوي تێدايە ! .

لە فضل ي رەقاشي ئەگێڕنەوە : هەر كاتێك باسي دنيا نەويستيان لەلا بكردبا ئەويش ئەيوت : جارێكيان بەلاي گۆڕستانێك دا ڕۆيشتم ئينجا تاوێك وەستام ، پاشان بانگي گۆڕستانم كرد و وتم : ئەي ئەوانەي تەنها ژياني دنياتان لەياد بوو ، بەس لەخەمي خۆشي و سەرگەرمي و كات بەسەربردن دابوون ، هەروەها ئەوانەش خەريكي خواپەرستي و پارێزگاري (تەقواكردن) بوون ، خەريكي ئەنجام داني كاري چاكە و بەدەست هێناني ڕەزامەندي خواي گەورە بوون بانگي هەردوو لايەكم كرد ، هيچ لايەكيان وەلآميان نەدامەوە ، خۆ ئەگەر هاتو وەلآميان بدابايەوە ، ئەوا بەشێوەي پەند و ئامۆژگاري لێوەرگرتن وەلآميان ئەدامەوە .

ئەگێرنەوە لە ماليكي كوڕي دينار ، كە ئەڵێت : من و حسان كوري باوكي سنان بەمەبەستي سەرداني گۆڕستان چوينە دەرەوە ، ئينجا ئەو پێشي من گەيشتە ئەوێ ، دواي بيركردنەوە لەبارودۆخي ئەوان و وەرگرتني پەند و ئامۆژگاري لێيان ، ڕووي كردە من و وتي : ئەي باوكي يەحيا ! ئەمانە كۆمەڵي مردوانن ، هەروەها ئەو برە زيندوانەي لەسەر دنياش ماون چاوەڕێ ئەكرێت ژياني دنيايان بەكۆتا بگات و بۆ ئێرەيان بهێنن ، پاشان بە فەرماني خواي گەورە (ﷻ) زيندوو بكرێنەوە ، و چاوەڕێي ڕۆژي لێپرسينەوە بكەن . پاشان "بە كاريگەري ئەم وتانە ماليك خەمێكي قووڵي هەڵكێشا ، و دەستي لەسەر سەري خۆي دانا ، فرمێسكي بەچاوەكان دا هاتە خوارەوە ، و دەستي بە گريان كرد" .

لە باوكي عاصم (الحيطي) ئەگێرنەوە ، كە ئەڵێت : جارێكيان لەگەڵ محمد كوري واسع لە دەرەوە ئەڕۆيشتين ، پاش ماويەك ڕێكردن گەشتينە گۆڕستانێك ، سەرئجم دا لەبەر كاريگەري

مردن و خامۆشی گۆڕستان فرمێسك بە چاوەکانی محمد دا دێتە خوارێ ، پاشان وتی: ئـەی باوکی عاصم ! ئەم خامۆشیەی ئەوان لەناو گۆڕەکانیان لەخۆبایت نەکەن ، چونکە هەرچەندە گۆڕستان خامۆشە بەڵام لەهەمان کاتدا چەندەها ڕووداوی خۆش و ناخۆش ڕوودەدەن ، لەلایەك هەندێك خۆشیان بەسەر ئەبارێنرێت ، هەندێکیش لەولاوە سزای بە ئازار ئەچێژن ، غەمبار و دڵخۆشیان تێدایە .

ئیبن و سەمماکیش ئەڵێت : بێدەنگی ئەم گۆڕانە لەخشتەت نەبەن ، چونکە زۆربەی غەمبارەکان لێرەن ، هەروەها یەکسانیەکەی ئەوانیش لەخۆباییت نەکەن ، چونکە زۆرترین جیاوازی لەنێوان کەسەکان کە هەبێت ، ئالێرەدایە .

باوکی حازمی ئەعرەج ئەگێڕێتەوە , و ئەڵێت : جارێکیان ئامادەی ناشتنی مردوێك بوو ، لەکاتی ناشتنی مردوەکەدا لەسەر لێوی گۆڕەکەدا وەستا ، زۆر لێی ووردبوەوە ، و سەرنجی ڕاکێشا ، پاشان سەری خۆی بەرز کردەوەو بە هەندێك لە هاوەڵاکانی خۆی وت : چ ئەبینی ؟ ئەویش وتی : چاڵێکی وشك ، و جگە لە مردوەکە چەند تاشەبەردێکی لێیە ئەگەرنا هیچ نابینم . باوکی حازمیش وتی: سوێند بەخوای گەورە یان پاشەڕۆژێکی سوپاس کراو بۆ خۆت دابین ئەکەیت , ئێرە ئەبێتە شوێنێکی خۆش بۆت ، یاخود بەهۆی گوێڕایەڵی نەکردنت لە فەرمانەکانی خوای گەورە (ﷻ) ژیانێکی ناخۆش لەسەر دنیا بەسەر ئەبەیت ، و چارەنووسێکی تاڵیش چاوەڕێتە . پاشان دەستی کردە گریانێکی زۆر .

ئەگێڕنەوە لە حسین (الجعفی) ، ئەڵێت : جارێکیان لەسەر گۆڕستان گۆڕێك هەڵکەنرابوو ، هێشتا مردووی تێدا نەنێژرابوو ، پیاوێك هاتە سەر گۆڕەکە پاشان تەماشای ناوەوەی کرد ، زۆر لێی ورد بوەوە ، ئەوسا دەستی بە گریانێکی زۆر کرد ، وتی : سوێند بەخوای گەورە لە ڕاستیدا ئەی گۆڕ تۆ ماڵی ڕاستەقینەی منی ، ئەبێت بەهۆی ئەنجام دانی کردەوەی چاکە ئاوەدانت بکەمەوە .

ئەبو عەتاهیەی شاعیریش ئەڵێ :

(پرسیارم لە گۆڕ کرد :

چیت لەو کەسانە کرد ، کە لەناو خاکا نێژراون؟
وەڵامی دامەوە و وتی:
گۆشتەکەیانم لێ ڕزاندن
بۆگەنی کرد ،
لەدوای ئەم هەموە بۆنە خۆشەی
گوڵاوەکانی سەر دنیا
ئێستا ... بۆنەکەیان ئازارت ئەدات
لاشە جوانەکەیانم لێ خواردن
ئەم هەمو ناز و نیعمەتەی ئەوان بەبا چوو
تەنها ... ئەوەی ماوەتەوە
کاسەی سەرە و
لەگەڵ چەند ئێسکێکی لاواز
هەموی تێکەڵ بوە بە خاك) .

ئیبن ئەبو دنیا ئەڵێت : ئەبو ئیسحاق وتی : ئامادەی ناشتنی تەرمی هاوەڵێکی دێرنم بووم پەنجا ساڵ ئەبو هاوەڵ بوین ، دوای ئەوەی لەناو گۆڕدا ناشتیان و خۆڵیان بەسەر داکرد ، ئینجا لەگەڵ خاك دا یەکسانیان کرد ، خەڵکیش هەموو بڵاوەیان لێکرد ، منیش دانیشتم لە نزیك ئەم چەند گۆڕە ، و بیرم لە بارودۆخی ئەوان ئەکردەوە ، لەوەی کاتێك لەسەر دنیادا بوون ، بەڵام ئەبینی ئێستاکە لەژێر خاکن و بەتەواوی دابڕاون لە هەمو کاروبارێکی دنیا و ، بەهەمان شێوەش هەمو شتێکیش لەوان دابڕاوە ، بەغەمباری دوای وتنی صەلاوەت لەسەر دیداری پێغەمبەر (ﷺ) ئەم شیعرەم بەدەنگێکی کزوە وت :

(سلاوتان لێبێت خەڵکی گۆڕستان
وەها خامۆش و بێدەنگن
ئەڵێی نەهاتوونە سەر زەوی

دابنیشن لە مەجلیسان

بە ئاوی سارد

فێنك بکەن دڵی خۆتان

بە خواردنی خۆش

چێژ وەربگرن لە خواردنیان

دە پێم بڵێن :

کوانێ ، گۆڕی دووژمنتان

هەروەها ئەوانەش

کە بونە دۆستتان) .

لەوکاتەدا ، چاوەکانم زۆر قورس بوبون ، بەڵام بەغەمباری بۆی هەڵسام و ڕۆیشتم .

ئیبن ئەبو دنیا ئەڵێت : رەبیاشی "خوای گەورە میهرەبانی لەگەڵ بنوێنێت" شیعرێکی پێنج خشتەکی وتوە ، کە ئەڵێت :

(ماڵی مردوان ، سۆز و غوربەت ئەبزوێنێ

لە دیتنیان ، غەم ئەوروژێنێ

زۆر قورسە ، کاتێك بانگیان ئەکەیت

بەڵام ... وەڵامت نادەنەوە لەهیچ کاتێ

چۆن ، کەسێك کە مردو بێت

لەژێر خاك

لەگەڵ خۆڵا تێکەڵ بوبێت

دێتە گۆ

هاوەڵێت بکا لە دنیادا) .

هەروەها ئەم شیعرەش ئەڵێت :

(مردوە تا کاتی زیندوبونەوە

هەرچەندە لێمان نزیکی لێرە

بەڵام ، نایێیتە لامان هەرگیز بۆ ئێرە

لاشەت ئەڕزێت لە ناو خاك

بێدەنگ لەبیر ئەکرێیت

هەرچەند خۆشەویستی بۆ ئێمە ) .

بە سەنەدەوە ئەبو نەعیم ئەگێڕێتەوە ، و ئەڵێت : جارێکیان داودی طائی "پێش ئەوەی بۆ لای خوای گەورە بگەڕێتەوە ، و پشت لە دنیادا بکات" بە گۆڕستانێك دا ئەڕوات ، ژنێك لەسەر گۆڕستان ئەبێت و ئەم شیعرەی سەرەوە ئەڵێت ، ئەویش بەووردی گوێی بۆ ڕائەگرێت ، و سەرنجی ڕائەکێشێت ، ئەوەندە لای کاریگەر ئەبێت ، هەر ئەو شیعرەشە ئەبێتە هۆی پەشیمان بونەوە و گەڕانەوە بۆ لای خوای گەورە ، واتە : ئەبێتە هۆی ئەوەی خۆ لە خۆشیەکانی ژیانی دنیا و هۆکارەکانی دابڕێت ، و پشتی تێبکات ، خۆشی تەرخان بکات بۆ ژیانی دوارۆژ ، و کاربکات لە پێناو ڕەزامەندی خوای گەورە ، بۆ ئەوەی ئامادەباشی بکات بۆ ڕۆژی زیندوبونەوە .

بەکری خواپەرست جارێکیان لەسەر گۆڕستان گوێی لە ژنێك ئەبێت و ئەڵێت : (داخەکەم ، خۆزگە بمزانیبایە ئاخۆ کامە ڕوومەتت لەپێش دا خاك ڕزاندی ، هەروەها چاوەکانت کامەیان پێش ئەوتریان توایەوە) . کاتێك بەکر گوێی لەمە ئەبێت ، لەترس و پەژارەی دوارۆژ لە هۆش خۆی ئەچێت . ئیبن ئەبو دنیا لە پەرتووکی «الموت» دا باسی کردوە .

هەروەها لە پەرتووکی «الخائفین» لە محمد کوری (حسین)ی ئەگێڕێتەوە ، ئەویش لە عوبەیداللە کوڕی موسی ئەگێڕێتەوە ، کە ئەڵێت : حسن کوری صالح عادەتی وەهابو بۆ هەر کارێکی گرنگی وەك بانگ دان ، یان هەر کارێکی دیکە چوبایە لەپێش دا سەردانی گۆڕستانی ئەکرد و زۆر بیری لە مردن ئەکردەوە ، زۆر جاران ئەوەندە بیری لێئەکردەوە ، بەدەوری گۆڕەکاندا خولی ئەخوارد ، هاواری ئەکرد ، لەهۆش خۆی ئەچوو ، ئینجا کەسە نزیکەکانی هەڵیان ئەگرت و ئەیان بردەوە ماڵەوە .

جارێکیان ئامادەی ناشتنی تەرمی مردوێك بوو، پاش ئەوەی گۆڕەکەیان بۆ ئامادەکرد ، و خەریك بوون بینێژن . حسن چوە سەر گۆڕەکە و زۆر بە وردی سەیری ناوەوەی ئەکرد ، و بیری لێ ئەکردەوە ، جەستەی ئاردقەیەکی زۆری کرد ، لەهۆش خۆی چوو ، پاشان بەو دارەبازەی مردوەکەیان پێهێنابوەوە سەر گۆڕستان ، (حسن)یان لەسەر ڕاکشاند و پێیان بردەوە ماڵەوە .

هەروەها بە سەنەدەوە لە عەنبەسەی خەوواص ئەگێڕێتەوە : کە پیاوێك چوە گۆڕستان لەوێ کەللە سەرێکی بینی "زۆر خەمی پێ هەڵگرت" ئەوسا ویستی بینێژێتەوە ، بۆ ئەم مەبەستە چاڵێکی هەڵکەند و ناشتیەوە ، پاشان سەیرێکی چواردەوری خۆی کرد ، هەمووی هەر گۆڕستان بوو ، مردووی تێدا نێژرابوو ، بۆیە ئەمجارەش زۆر دڵگیربوو ، خەمێکی زۆری خوارد ، پاشان لەگەڵ خۆی کەوتە گفتوگۆ ، و ووتی : ئەگەر هەندێکیان قسەیان بکردبایە ، ئەوا پرسیارم لێ ئەکردن لەبارەی ئەو بارودۆخەی کە بینیم. ووتی : کاتێك خەوتم ، لەخەوما پێیان وتم : هەڵمەخەڵەتێ بەوەی مردوان لەناو گۆڕدا ئەنێژیت ، و ژێر خاکیان ئەکەیت ، چونکە ئەم مردوانە ئێستا لاشەیان ڕزیوە و تێکەڵ بە خاك بۆتەوە . لەهەمان کاتدا هەیانە دڵخۆشە و چاوەڕێی پاداشتی خوای گەورە (ﷻ) ئەکات ، هەروەها هەشیانە دڵ بەخەم ، چاوەڕێی سزا و تووڕەبوونی خوای گەورە (ﷻ) ئەکات ، بۆیە نەکەی ئەوەی دیتت لەیادی بکەیت، ئەوسا ئەگێڕنەوە لەوکاتەوە پیاوەکە (میهرەبانی خوای گەورەی لێبێت) تاوەکو لەژیاندا مابوو، خواپەرستیەکی زۆری ئەکرد و هەمیشە مردنی لەبەر چاوان بوو .

❊ ❊ ❊

**وچانێك**

ئیبن ماجە و ترمذی ، دەریانهێناوە لە فەرموودەی هانئ "خزمەتکاری عثمان" کە ئەڵێت : عثمان (رضي الله عنه) عادەتی وەهابوو هەر کاتێك لەسەر گۆڕی هەر یەکێك وەستابا ئەوەندە ئەگریا تاوەکو ڕیشەکەی تەڕ ئەبوو ، بۆیە جارێك پێیان وت: ئایا کاتێك باسی بەهەشت و دۆزەخت بۆ ئەکەن ناگرییت ، بەڵام کاتێك لەسەر گۆڕی هەر یەکێکی ئەوە زۆر ئەگرییت ، ئایا هۆکاری ئەمە چیە ؟ ئەویش وتی : لەڕاستیدا پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی : «گۆڕی مرۆڤ یەکەمین

قۆناغی ژیانی دوارۆژە ، ئینجا ئەگەر خاوەنەکەی لە سزای گۆڕ رزگاری بو ئەوە قۆناغەکانی دوای ئەو ئاسانترە ، بەلاّم ئەگەر لە سزای گۆڕ رزگاری نەبوو، ئەوا قۆناغەکانی دواتری سەخت و دژوارترە» . هەروەها وتیشی : پێغەمبەر (ﷺ) لە شوێنێکی دیکەدا ئەفەرموێت : «هیچ دیمەنێکم ئەوەندەی دیمەنی گۆڕ بە سامناکی نەبینیوە» . {حاکم گێراویتیەوە و بەصەحیحی داناوە ، هەروەها "ذهبی"ش ، لەگەڵی هاوڕایە} .

پێشەوا ئەحمەد و ئیبن ماجە لە فەرموودەی براء دەریانهێناوە ، کە ئەڵێت : جارێکیان ئێمە لەگەڵ پێغەمبەری خوادا بووین (ﷺ) ، کۆمەڵێك خەڵکی لەولاوە بینی ، بۆیە فەرمووی: ئایا ئەم خەڵکە بۆچی کۆبونەتەوە ؟ یەکێك لە هاوەڵانیش وەڵامی دایەوە وتی : یەکێك مردوە و گۆڕی بۆ هەڵئەکەنن . بۆیە پێغەمبەر (ﷺ) داچڵەکی , و یەکسەر بەخێرایی بەرەو لای ئەوان بەرێکەوت ، ئەوەستا تاوەکو گەیشتە سەر گۆڕەکە ، و لەوێ لەسەر گۆڕەکە چۆکی دادا. وتی : منیش چومە ئەوێ بۆ ئەوەی بزانم پێغەمبەری خوا (ﷺ) چی ئەکات ، سەیرم کرد ، لەبەر کاریگەری بارودۆخەکە "واتە : مردن و گۆڕ" بە خوڕ فرمێسك بە چاوەکانی دا دێتە خوار ، پاشان ڕووی کردە خەڵکەکە ، و فەرمووی: «ئەی براکانم بۆ ڕۆژێکی ئەوەها سەخت خۆتانی بۆ ئامادە بکەن» . {ئەحمەد گێراویەتیەوە ، سەنەدەکەشی حسن ە} .

بەسەنەدەوە ئیبن ئەبو دنیا لە حسن ئەگێرێتەوە ، کە ئەڵێت : ڕۆژێکیان برایەکمان مرد ، دوای ئەوەی بردمانە سەر گۆڕستان و ناشتمان ، (صلە)ی کوری ئەشیەم هاتە سەر گۆڕەکەی و ، وتی :

(ئەگەر لەسزای نێو گۆڕ ڕزگارت ببێت
ئەوا ، قۆناغەکانی دوای ئەمە هەمووی ئاسانە
بەلاّم ئەگەر ڕزگارت نەبوو
گومان نابەم ، لەوانی دیکەش ڕزگارببێت).

بە سەنەدەوە لە حەجاجی ئەسوەد ئەگێرێتەوە ، ئەڵێت : خەوێکم بینی ، تیایدا لەناو گۆڕستان دابووم، من و خەڵکی ئەوێ "واتە: مردوەکان" بەیەکەوە لەناو گۆڕداین ، زەوی خۆی

ناوەڵا کردبووەوە ، بە ئاشکرا بارودۆخی ئەوانم ئەبینی ، ئەمزانی لە چ دۆخێکدان، بینیم هەندێکیان لەسەر زەوی خەوتبوون ، هەندێکیان لەسەر گوڵی بۆن خۆش خەوتون ، هەندێکیشیان بەزەردەخەنەن لەسەر خاك ، هەروەها بەهۆی نوور و ڕووناکی هەندێکیان ئەم ناوە رووناك بۆتەوە ، هەندێکیشیان تێکەڵەیەکن لە ڕووناکی، ئینجا ووتی : کاتێك ئەو بارودۆخەم بینی ، هەریەکە و بەجیا لەدۆخێك دان : هەیانە خۆش ، یاخود ناخۆشە حاڵی ، فرمێسکم بەچاوەکاندا هاتە خوارێ و دەستم بەگریان کرد پاشان لەخەوم دا وتم : پەروەردگارا ! خۆزگە هەموویان لەو پێ بەخشینی کەرامەت و ڕێزەدا یەکسان ئەبوون . لەوکاتەدا بانگکەرێك لەلایەکی گۆڕستان بانگی لێ کردم ، و وتی : ئەی حەجاج ! ئەم جیاوازیەی ڕێز و پلە و پایەیان ، بەهۆی ئەنجام دانی کردەوەکانی ژیانی دنیایانە . بۆیە لە ترس و سامناکی قسەکانی ئەو لەخەوەکەم دا بەئاگاهاتم .

لە سەلمەی بەسری ئەگێرنەوە ئەڵێت : جارێکیان پیاوێك لەسەر گۆڕێك وەستابوو، کە زۆر جوان دروست کرابوو، جوانیەکەی سەرنجی ڕاکێشابوو، ماوەیەك سەیری ئەکات ، پاش ئەوەی شەو دادێت ، پیاوەکە ئەڵێت : خەوم بینی ، بینیم پیاوێك هات و لەنزیکمەوە ، وەستا ، سەرنجم دا دەم و چاوی گۆڕاوە ، ئەم شیعرەی وت:

(جوانی و ڕێکی ئەم گۆڕە سەرنجی ڕاکێشان
لەکاتێك دا لاشە تێیدا رزیوە
برۆ لە مردوەکان ، لە بارەی حاڵیان
لێیان بپرسە
ئنجا ئەزانی ، کە چ سامناکە
ژیانی ئەوێیان)

هەروەها دیسان لە سەلمەی بەسری ، ئەگێرێتەوە و ئەڵێت : لەخەوما بەزیغی کوڕی مەسروری خواپەرستم بینی ، کە لە ژیانی دنیایدا هەمیشە زمانی بەیادی خوای گەورە تەڕ بوو، بەردەوام بیری مردنی ئەکرد ، شەونوێژی زۆری هەبوو، بۆیە کاتێك هاتە خەوم لە بارودۆخی ژیانی ناو گۆڕم لێ پرسی، وتم : شوێنت چۆنە ؟ ئەویش وتی :

(کەس نازانێت چ ، ڕووئەدات لەناو گۆڕا
تەنها ...
خوای گەورە و ئەوکەسەی وا لەناوی دا نیشتەجێیە
ئەزانێت وا چ ڕووئەدا) . پاشان ڕۆیشت و بەجێی هێشتم .

بە سەنەدەوە لە روح کوری وەراق ئەگێرێتەوە ، و ئەڵێت : لەخەوما ئیبراهیمی مەحکەمیم بینی، کە لەژیانی دنیایدا ئەوەندە بەڕۆژوو بوو تاوەکو ڕەنگی ڕەش هەڵگەرابوو، ئینجا پێمووت : لە چ بارودۆخێك دای ، لەکاتێکدا تۆ ئێستا لە ژیانی دواڕۆژدای ؟ وتی : گریا، پاشان وتی : خەم و پەژارەی زۆربەی مردوان ، سامناکی ناو گۆڕە . منیش وتم : ئەی تۆ بارودۆخت چۆنە ؟ وتی : زۆر باشم ، سوێند بەخوای گەورە ، بە فەزڵ و میهرەبانیەکەی ، گەیشتم بەڕەزامەندی ئەو

ئەگێرنەوە لە خواپەرستێکی خەڵکی بە لقاء ، کە ناوی وەسیم بوو ، ئەڵێت : ڕۆژێکیان ئافرەتێکی لە خوا ترسی نزیکمان بۆی باس کردم، ماوەیەك بوو کوڕێکی کۆچی دوایی کردبو ، هەر بیری ئەکرد و بەردەوام چاو بە فرمێسك بوو، وتی : دوای ساڵێك لە مردنی کوڕەم ، جارێکیان هاتە خەونم ، بینیم بە کفنەوە لەناو گۆڕەکەی بە پەشۆکاوی دانیشتوە ، منیش لێی نزیك بومەوە ، دیمەنێکی زۆر سامناك بوو ، بۆیە پێمووت: ئەی کوڕم شوێنت چۆنە ؟ لە وەڵامدا ڕووی گرژ بوو ، پاشان وتی :

(لەناو خاك دا بەندم
لاشەم لەبەریەك هەڵوەشاوەتەوە
ئەگەر ژیانم لەوێ ئەبینی
لەجیاتی فرمێسك
خوێن بەچاوت دا دێتە خوارێ) .

پاشان ڕاکشا لەناو گۆڕەکەیدا، دواتر تەنها لە هێڵێکی ڕەش بەولاوە هیچی دیکەم نەبینی ، ئینجا گۆڕەکە چووەوە یەك و ، کوڕەکەم لەبەر چاوان ون بوو وتی: کاتێك لەخەو بە ئاگا هاتم ،سوێند بەخوا لەبەر سامناکی ئەو بارودۆخەی کە بینیم هێشتا هەر ئەترسام .

فضل ی کوری موهەلهەل ئەگێڕێتەوە ، و ئەڵێت : برایەکم هەبوو، ناوی مجیب بو ، زۆر خواپەرست بوو ، بەردەوام لەگەڵمان بوو ، پیاوێکی جوان و لەبەر دڵان بوو، هەمیشە و بەردەوام بەڕۆژ ، ڕۆژووی ئەگرت ، بەشەویش ، شەونوێژی ئەکرد، پاشان نەخۆشیەك ئەگرێت و ، بەهۆیەوە کۆچی دوایی ئەکات ، هەروەها محمد کوری نضری (الحارث)ی هاوەڵێکی نزیکی ئەوبو ، لەگەڵ یەك وەك برا وابون ، بەڵام محمد پێش مجیب کۆچی دوایی ئەکات ، ئینجا پاش کۆچی دوایی مجیب ، شەوێکیان محمد لە خەونم دا ئەبینم ، منیش پێم وت : براکەت مجیب چی کرد ؟ ئەویش وتی: بە ئەنجامی کردەوکانی خۆی گەیشت. پێموت : لە دنیادا زۆر جوان بوو، ئەی ئێستا لەڕووی جوانیەوە چۆنە ؟ ئەویش وتی: سوێند بەخوای گەورە خاك و خۆڵ جوانیەکەی هەموو شێواندوە . منیش پێم سەیر بوو !! لە ژیانی دنیادا ئەو هەمو ڕۆژووە و ئەنجام دانی شەونوێژ و خواپەرستیە زۆرە ، ئینجا وەهای بەسەر بێت ، بۆیە لێم پرسی : چۆن وەهای بەسەر هاتوە ، لەکاتێکدا تۆ ئەڵێیت : بە ئەنجامی کردەوەکانی خۆی گەیشتوە ، خۆ لە دنیادا خواپەرستێکی کەم وێنە بو ؟ ئەویش وتی : ئەی برام نەتزانیوە لاشەی مرۆڤ لەناو گۆڕدا ئەڕزێت و کردەوەکانیش لە دواڕۆژدا زیندوو ئەمێنن . منیش وتم : واتە لاشەی مرۆڤ بەتەواوەتی تێکەڵ بەخاك ئەبێتەوە ، تاوەکو هیچی لێنامێنێتەوە ، پاشان لە ڕۆژی زیندوبونەوەدا ، زیندو ئەکرێنەوە . ئەویش وتی: بەڵێ براکەم بەدڵنیاییەوە هەڵئەوەشێنەوە تاوەکو ئەبنەوە خۆڵ ، پاشان کاتی زیندوبونەوە لەگەڵ دەنگی کەڕەنا (نەفخەی صور) زووتر لەچاو تروکانێك زیندوو ئەبنەوە .

هەر لەبارەی گۆڕەوە هەندێك لە شاعیران ئەم شیعرەیان وتوە :

(ئەوەی مرد و چوە ناو گۆڕ نایەتەوە

شایانی بەزەییە ، بێ گیان ماوەتەوە

ئاخ و داخی خۆشەویستیش بەهانای نایێ

هەرچەند نزیکە لێی ، بەڵام هەرگیز نایگاتێ
هەر دوێنێ بوو سەرنج ئەدرا بۆ جوانیەکەی
وا ئێستاکەش تێکەڵ بووە خاکەکەی
گۆڕدرایەوە دانیشتنی جارانی بەیەکی دی
ماڵ و سامانیشی
دابەش کرا بەسەر ئەوانی دی
وا ئێستاکەش لە ژێر خاکا
بەڵام ئەڕوات هەمو ماڵ و سامانەکەی).

ئیبن بەراء بە سەنەدەوە لە (عیاض)ەوە ئەگێڕێتەوە ، و ئەڵێت : جارێکیان پیاوێکم بینی ئەگریا ، منیش پێموت: بۆچی ئەگریت ؟ وتی: قسەیەك منی گریاندم . وتم : کامەیە ؟ وتی : جارێکیان لە گۆڕستان بووین ، یەکێك لە ئامادەبوان ئەمەی وت :

(چومە گۆڕستان و بانگم لیٚ کردن
کوانێ ئەوانەی خۆیان بە گەورە ئەزانی و
بە فیزبوون
وە ئەوانەش دەسەلاٌتدارو بەهێزبوون
کوانێ دەسەلاٌت و ماڵ و سامانیان
بۆ کوێ رۆیشت لەگەڵ مردنیان)
ئینجا گۆڕ بەزمانی حاڵ هاتە وەلاٌم :
(هەمویان لەناو چوون
هیچ هەواڵدەرێك نیە
هەموویان مردن نەماوە هەواڵیان
نەی ئەو کەسەی هەواڵیان ئەکەی
بۆ پەندێك وەرناگریت لێیان

دێت و ئەڕۆن هەموو دەسەڵاتداری
لەناویش ئەچێت هەموو خاوەن جوانیّ) .

جەعفەری کوری سلیمان لە مالیکی کوری دینار ئەگێڕێتەوە ، کە ئەڵێت : جارێکیان چومە گۆڕستان و ئەم شیعرانەم ووت . پاشان وتی بانگکەرێك بانگی کرد و ووتی :

(هەمویان لەناو چون هەواڵنێریّ نیە
هەمویان مردن لەگەڵ هەواڵیان).

ئینجا هەموو شیعرەکەی تەواو کرد .

دیسان بەسەنەدەوە لە بەراء ئەگێڕێتەوە لەسەر گۆڕی یەکێك ئەم شیعرە نوسرابوو :

(مردن بوو منی دەرچوان لە ماڵەکەم
خاك و خۆڵە ئێستاکە شوێنم
لەپاش ماڵە جوانەکەم
توخوا ئەو کەسەی هاتویتە سەر گۆڕم
پەند وەربگرە لە ژیانەکەم
کاتیّ ئەترسێی لە مردن و داهاتوو
لەگۆڕانی ژیان لە ، لەناو چوون
بپارێوە لە خوای گەورە
بۆ لابردنی سزایەکەم
داوای سەرفرازیم بۆ بکە
لە ڕۆژی وەستانەکەم
ئەمە چارەنووسی نەوەی دنیایە
با هەرچەند لە خۆشی دابن
و بیّ ئاگابن لەمردن) .



ئیبن ئەبو دنیا لە محمد كوری حسین ئەگێڕێتەوە و ئەڵێت : ئەبو عومەر (العمری) بۆی باس كردم و ئەڵێت : عوبەیداللە كوڕی (صدفە) كوڕی مرداس ئەلبەكری ئەویش لە باوكیەوە بۆی باس كردوە ، ئەویش لە شێخێك لەیەكێك لە گوندەكانی وڵاتی ئەندەلوس بۆی گێڕاوەتەوەو، ئەڵێت: سەردەمانێك سێ برا لە شوێنێك دا ئەبن ، یەكێكیان بەرپرسە لای سوڵتان و كاروباری خەڵك بەڕێوە ئەبات، دووەمیان بازرگانێكی دەوڵەمەندە، كە بازرگانی وڵاتان ئەكات، ئەوەی دیكەش خواپەرستێكی دنیا نەویستە , خۆی یەكلا كردۆتەوە بۆ پەرستنی خوای گەورە .

ئینجا وتی : پاش ئەوەی خواپەرستەكە كاتی مردنی دێت ، نەخۆش ئەكەوێت , ئەگاتە سەرەمەرگ , و هەردوو براكانی لە لای كۆ ئەبنەوە، خواپەرستەكەش پێیان ئەڵێت : ئەگەر من مردم ، ئەوا جوان بمشۆن ، پاش كفن كردن و شاردنەوەی تەرمەكەم لەشوێنێكی پاك دا لە زەوی ، ئەوە ئەم شیعرەم لەسەر كێلی گۆڕەكەم بنووسن :

(كەسێك چۆن خۆشی لە ژیان ئەبینێ

كە ئەزانێت بەوەی خوای گەورە لێی ئەپرسێتەوە

لە ئەنجام دانی كردەوەی خراپە

سزای ئەدات

هەروەها

پاداشتی كردەوەی چاكەشی ئەداتەوە) .

ئینجا وتیشی دوای ئەوەی ئێوە ئەم كارانەتان ئەنجام دا ، هەموو رۆژێك وەرنە سەر گۆڕم ، تكاوایە پەند و ئامۆژگاری لێ وەرگرن .

وتی: دوو برایەكە ، ڕاسپاردەكەیان بە تەواوی بەجێ گەیاند . ئەڵێت : رۆژێكیان برا بەرپرسەكەی لەگەڵ كۆمەڵێك لە بەرپرس و فەرمانبەرانی خوار خۆی لە ڕێدا ئەبێت تاوەكو ئەگاتە لای گۆڕی برا خواپەرستەكەی ، لەوێ لائەدات ، ماوەیەك ئەمێنێتەوە , بیر لە مردن ئەكاتەوە ، هەروەها لە هەمان كاتیش دا ئەو شیعرەی لەسەر گۆڕەكە نوسراوە ئەخوێنێتەوە ، زۆر دڵگیر ئەبێت ، هەست و سۆزی ئەجوڵێت ، بۆیە فرمێسكی بەچاوان دا دێتە خوار و ئەگرێت ،

لەسەر ئەم بارودۆخە ئەمێنێتەوە تاوەکو ڕۆژی سێیەم ، دوای ئەوەی ئەگاتە سێیەم ڕۆژ ، خۆی ئامادە ئەکات بڕوات ، لەوکاتەی ئەیەوێت بڕوات ، گرمە و دەنگێکی بەهێزی لەناو گۆڕدا گوێ لێ ئەبێت ، زۆر سامناك ئەبێت ، خەریکە دڵی لە لێدان بوەستێنێت، و ڕەنگی لە ترسان ئەگۆڕێت ، بەم شپرزەییە ئەڕوات و بەردەوامیش بیر لەم دەنگە بەهێزەی ناو ئەم گۆڕە ئەکاتەوە ، ئنجا کاتێك شەو دادێت ، لە نوستنیدا براکەی لە خەونیدا ئەبینێت ، پێی ئەڵێت : ئەی برام ئەم دەنگە بەهێز و سامناکە چی بوو لەناو گۆڕەکەتدا دروست بوو ؟ ئەویش ووتی : ئەمە ستەم و خراپەکاری بوو بینیم ، چونکە پێیانووتم : تۆ کەسێکت بینیوە ستەمیان لێ ئەکرد ، لەگەڵ ئەوەی دەسەڵاتیشت هەبوو یارمەتیت نەدا . کاتێك لەخەو بە ئاگا هات بانگی برایە بازرگانەکە و کەس و کارەکەی کرد ، خەونەکەی بۆ گێڕانەوە و، وتی: ئەبینم کاتێك برایە خواپەرستەکەمان ڕاسپاردەی ئەوەی پێسپاردین کە لەسەر گۆڕەکەی ئەمە بنووسین ، مەبەستی ئەوە بوە کە سەرەنجامی گرنگی دان ، تەنها بە دنیا و ئەوەی لەناوی دایە ، بەبێ ڕەچاوکردنی ژیانی دوارۆژ ، کارێکی هەڵەیە و پەشیمانی لەدواییە ، بۆیە لە ئێستا بەدواوە ئێوە شاهید بن بەتەواوی واز لە دنیا ئەهێنم و تەنها خۆم بۆ خوا پەرستی تەرخان ئەکەم .

وتی : ئنیجا وازی لە بەرپرسایەتی و کاروباری دەوڵەت هێنا و ، خۆی تەرخان کرد بۆ خوا پەرستی ، لە هەمان کاتیش دا نامەیەکی وازهێنانیشی نووسی و بۆ عبدالملك کوڕی مەروان ی نارد ، و تێیدا وازهێنانی خۆی لە کاروبارەکانی وڵات دا ڕوون کردبووەوە ، باسی ئەوەشی کردبو لەوەی ئەیەوێت بیکات ، هەروەها لەو برە تەمەنەی ماویەتی ئازادبێت و بەتەواوەتی دەست بەرداری بن و لەبیری بکەن .

بەڵی بەتەواوی پشتی لە دنیا کرد , لە ئاوەدانی دوورکەوتەوە و لە چیایەك دا ماوەی ژیانی تێدا بەسەر ئەبرد، بەمشێوەیە مایەوە تاوەکو کاتی مردنی داهات ، کاتێك گەیشتە سەرەمەرگ ، بەدوای براکەی نارد ، کاتێك برایەکەی هات پێیوت : ئەگەر مردم لەتەنیشت گۆڕی براکەم بمنێژە ، هەروەها ئەم شیعرەشم لەسەر گۆڕی بنووسە :

(چۆن لە ژیاندا خۆشی وەرئەگرێ

که دڵنیایه بێ ئاگا

مردن یەخەی وا ئەگرێ

له گەورەیی و سامان

بێ بەشی ئەکا

تەنها و بەس خاکه

هاوەڵی ئەبێ

کەسانێکی دی لەجیاتی ئەو

لەنێو خانوەکەی

ئەکەن هەڵپەرکێ) .

پاشان پەیمانی لێوەرگرت دوای مردنەکەی ، تاوەکو سێ ڕۆژان لەنزیك گۆڕەکەیدا بمێنێتەوه ، لەکاتی مانەوەیدا داوا له خوای گەوره بکات که بەزەیی پێدابێتەوه . ئینجا مرد ، برایه زیندوەکەی ڕاسپاردەکەی ئەوی بەتەواوی بەجێ گەیاند ، پاش ئەوەی سێ ڕۆژان له نزیك گۆڕەکەی مایەوه ، ویستی بچێتەوه سەر ژیانی ئاسایی و لەوێ بڕوات ، لەوکاتەدا لەناکاو دەنگێکی سامناکی لەناو گۆڕی برایه تازه مردوەکەی بیست ، بەشێوەیەك بەترس و سامناك بوو ، خەریك بوو ئەقڵی لەسەر بباته دەرەوه و شێتی بکات . بەم ترسەوه گەڕایەوه ماڵەوه , کاتێك شەو داهات برایەکەی "ئەوەی تازه مردبوو" هاته خەونی و سەردانی کرد . بۆیه منیش پێموت : ئەی برام تەنها هاتویته سەردانمان ؟ ئەویش بەسەر سوڕمانەوه وتی : براکەم لەدوای ناو گۆڕ هیچ شوێنێکی دیکه نیه دەرون لێیەوه ئارام بگرێت . منش وتم : ئەی تۆ چونی ؟ ووتی : زۆر باشم ، چونکه تەوبە کردن و گەڕانەوه بۆ لای خوای گەوره هەموو چاکەیەکت پێ ئەبەخشێت . وتم : ئەی براکەم چۆنه (واته : برایه خواپەرستەکەی) چۆنه ؟ وتی : لەگەڵ پیاو چاکان دایه. وتم : ئەی پاشەڕۆژی ئێمه لەدوای تۆ چۆن ئەبێت ؟ ئەویش وتی : هەر کەسێك خۆی بۆ کارێك تەرخان بکات ، ئەوا بەرهەمەکەی ئەدرویتەوه ، بۆیه پێش ئەوەی له دەستت بچێت بۆ سەرفرازی خۆت کاربکه .

لەوکاتەوە ، دوای ئەوەی لە خەو هەڵسا ، خۆی لە خەڵك دابڕی ، هەمو ماڵ و سامانەکەی بەسەر خەڵك دا ، دابەش کرد , ئینجا ماوەی ژیانی خۆی تەرخان کرد بۆ پەرستنی خوای گەورە . کوڕێکی گەنجی زۆر جوانی لێوەپاش کەوت . کوڕەکەی ڕووی کردە کارکردن و بازرگانی کردن ، تاوەکو سەرکەوتنێکی باشی وەدەست هێنا و ماڵێکی زۆری کۆکردەوە ، کاتێك باوکی گەیشتە سەرە مەرگ ، باوکەکە بە کوڕەکەی وت : ئەی کوڕم ئەگەر مردم ئەوە لەلای گۆڕی مامەکانت بمنێژە ، ئەم شیعرەش لەسەر کێلی گۆڕەکەم بنوسە :

(خۆشی چۆن ئەبینێت کەسێك

کە بەرەو مردن ئەڕوات

لەناو گۆڕدا هەموو جوانی لەناو ئەچێت

هەمو لاشەی لەگەڵ خاکدا ، تێکەڵ ئەبێت

ڕووناکی ڕووی گەشی تاریك ئەبێت) .

ئینجا ئەگەر مردم پەیمانم بدەیێ کە سێ ڕۆژان لە نزیك گۆڕەکەم بمێنەوە ، لە خوای گەورە "بۆ من" بپاڕێوە و نزا بکە تاوەکو لە تاوانەکانم خۆش بێت . دوای ئەوەی کە پیاوەکە مرد ، کوڕەکەی تەواوی ڕاسپاردەکانی بەجێ گەیاند ، هەروەها تاوەکو سێ ڕۆژان لەسەر گۆڕەکەی مایەوە ، لە ڕۆژی سێیەمدا لەو کاتەی کە خەریك بوو بڕوا و ئەوێ بەجێ بهێڵێ و بچێتەوە سەر ژیانی ئاسایی خۆی ، دەنگێکی گەورەو سامناکی لەناو گۆڕی باوکی بەر گوێ ئەکەوێ، لەترساندا موی پێستی گرژ بوو ڕەنگی گۆڕا ، بە ترس و لەرزەوە بەم شپرزەییە گەڕایەوە ماڵەوە ، ئینجا پاش ئەوەی شەو داهات و خەوت ، باوکی هاتە خەونی ، پێیوت: کوڕەکەم ! تۆ ماوەیەکی کەمە لەلای ئێمەی ، ژیان بەجۆرێکی دیکەیە لەوەی بیری لێ ئەکەیتەوە ، مردن زۆر لەوە نزیکترە کە مرۆڤ بیری لێ ئەکاتەوە ، بۆیە خۆت ئامادە بکە بۆ گەشتی دوورو درێژت ، ئامادەسازی تەواو بکە بۆ ڕۆیشتنت ، بۆ ماڵی هەمیشەییت خۆت ئامادە بکە ، دنیا ویستەکانی پێش تۆ لە خشتەت نەبەن ، ئەوانەی هیوایەکی زۆریان بەم دنیایە هەبوو وایان زانی ئەمە ماڵی هەمیشەییانە ، و خوای گەورەیان لەبیر چۆوە ، بۆ پاشەڕۆژ خۆیان ئامادە نەکرد ، بەڵام کاتێك مردنیان گەیشتە سەر فریای

هیچ نەکەوتن پەشیمانیەکی زۆر دایانگرت ، هەروەها داخێکی زۆریان هەڵکێشا بۆ تەمەنی لە دەست چویان ، بەڵام بەداخەوە پەشیمانی لەکاتی مردن دا هیچ سوودێك بە خاوەنەکەی ناگەیەنێت ، هەروەها خۆشحاڵیش نەبون ، و لە خۆیان نەبوری لەو کەمتەرخەمیەی لە کاتی زیندوێتی کردبوویان، خوای گەورە ڕزگارت بکات لە چارەنووسی لە ڕێدەرچوان و گوناهکاران ، ئەو چارەنووسە خراپەی لە ڕۆژی دوایی چاوەڕێیان ئەکات ، کوڕەکەم تاوەکو لە دەستت نەچوە خێراکە ... خێراکە ... خێراکە .

گێرەرەوەکە ئەڵێت : بۆ بەیانیەکەی دوای ئەو شەوەی کە خەوەکەی تێدا بینی بوو سەردانم کرد . کوڕەکە خەونەکەی بۆ ئێمە بە درێژی گێڕایەوە ، هەروەها وتیشی: بەتەواوی لەگەڵ ئەوەی باوکم لە خەونم دا پێیوتم هاوڕام ، تەنها مردن ئەبینم و بیری لێ ئەکەمەوە . بۆیە پاش ماوەیەك ئەو قەرزاریەی کە لەسەری بوو دایەوە و ماڵەکەشی بەسەر خەڵکی دا ، دابەش کرد، داوای ئەوەشی لێ ئەکردن لێی خۆش بن و گەردنی ئازاد بکەن ، لە هەر کەموکوڕی و تاوانێك کە هەیبوبێت لێی ببورن . دوعا خوازی لێ ئەکردن و ئەوانیش بەهەمان شێوە دوعا خوازیان لێ ئەکرد ، هەروەها ئەشی وت : بابم پێیوروتومە : خێراکە...خێراکە...خێراکە ، ئەمە سێ کاتژمێر ڕۆیشت ، هیچ نەبووە ، ڕەنگە سێ ڕۆژ بڕوات هەروا بمێنمەوە ، یاخود سێ مانگ ، یان سێ ساڵ و زیاتر ئەمێنمەوە ، بەمشێوەیە بەردەوام ماڵی خۆی ئەبەخشیەوە تاوەکو سێ ڕۆژ بەسەر ئەو شەوەدا ڕۆیشت کە خەونەکەی تێدا بینی بوو ، لە کۆتایی ڕۆژی سێیەم دا دوعا خوازی لەماڵ و منداڵەکانی کرد ، دوایی ڕوو بە ، ڕوگە"قبلە" ڕاکشا و چاوەکانی داخست ، شایەتمانێکی درووستی هێنا ، پاشان گیانی دەرچوو مرد .

گێرەرەوە ئەڵێت : دوای مردنەکەی ماوەیەك خەڵك لە شوێنانەوە ئەهاتن ، بۆ ماوەیەك لەسەر گۆڕەکەی ئەمانەوە و نوێژیان لەسەر ئەکرد . بەهەمان شێوە یادی خێر و چاکەکانی کوڕی مرداس یان ئەکرد ، و بیریان لە نوسینی سەر کێڵی هەرسێ گۆڕەکەی دیکە ئەکردەوە .

❊ ❊ ❊ ❊ ❊

پێشەوا ئەحمەد ، و ترمذی ، و حاکم دەریانهێناوە لە فەرموودەی کوڕی مەسعود ، ئەویش لە پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەگێڕێتەوە ، کە جارێکیان بە هاوەڵەکانی ئەفەرموێت : «بەتەواوی و بەڕاستی شەرم و ئابڕو لەخوای گەورە (ﷻ) بکەن ، ئەوانیش ووتیان : بەدڵنیاییەوە ، سوپاس بۆ خوا ، ئێمە شەرم لە خوا ئەکەین . پێغەمبەریش (ﷺ) فەرمووی: بەڵام شەرمکردنی بەڕاستی ئەوەیە : بەتەواوەتی لاشەی خۆت "واتە: زمان و چاو , و گوێ و سك و هەموو ئەندامەکانی دیکەی لەش" لە بێ فەرمانی خوای گەورە بپارێزی ، هەروەها یادی مردن و ڕزین و لەناو چوونی لاشە لەناو گۆڕدا ، بکەیتەوە ، هەرکەسێکیش ژیانی دواڕۆژی مەبەست بێت جوانیەکانی دنیا واز لێ ئەهێنێت و ڕوو لە پاشەڕۆژ ئەکات ، ئنیجا هەرکەسێك بەمشێوەیە بێت ، ئەوە بەتەواوی شەرم لە خوای گەورە (ﷻ) ئەکات» . {پێشەوا ئەحمەد گێراویتیەوە ، فەرمودەیەکی حسن - ە} .

بەسەنەدەوە ئیبن ئەبو دنیا لە ضحاك ئەگێڕێتەوە ، و ئەڵێت : جارێکیان پیاوێك پرسیاری لە پێغەمبەری خوا (ﷺ) کردو وتی : چ کەسێك لە هەمووان دنیا نەویست تره ؟ ئەویش فەرموی : «کەسێکە گۆڕو ناخۆشیەکانی ناوی لەبیر نەچێتەوە، پشت لە جوانیەکانی دنیا بکات ، ڕووەو پاشەڕۆژ هەنگاو بنێت ، ژیانی هەتاهەتایی بە باشتر دابنێت لە ژیانی دنیا کە لەناو چوە و سنووردارە، بەشێوەیەك هیوای ئەوەندە بەژیانی دنیا درێژ نەبێت کە تەمەنی تاوەکو بەیانی درێژ نەبێت ، هەروەها خۆی بەخەڵکی گۆڕستان بژمێرێت» . {بەیهەقی گێراویەتەوە} .

ترمذی دەریهێناوە لە فەرموودەی کوڕی عومەر کە ئەڵێت : ڕۆژێکیان پێغەمبەری خوا (ﷺ) قۆڵی گرتم و فەرموی : ((خۆت وەك نامۆیەك دابنێ، یاخود ڕێبوارێ، هەروەها گۆڕستان بە شوێنی ڕاستەقینەی خۆت بزانە» . سەرەتای فەرمودەکە بوخاری دەریهێناوە . {بوخاری گێراویتیەوە} .

بە سەنەدەوە ئیبن ئەبو دنیا ئەگێڕێتەوە لە ئەبو "سەریع"ی شامی ، کە ئەڵێت : جارێکیان عومەری کوڕی عبدالعزیز لە دانیشتنێك دا بە یەکێك لە پیاوە ئامادەبوەکانی وت:

ئەمشەو بەهۆی بیر كردنەوە خەو نەچۆتە چـاوەكانم . پیاوەكەش وتی: ئەی دەسەلآتداری بڕواداران بیرت لەچ شتێك ئەكردەوە ؟ ئەو ووتی : بیرم ئەكردەوە لە گۆڕ و لەوكەسەشی لەناویدا نیشتەجێیە ، سەرنج بدە ، كەسێك زۆر نزیكە لێت و بەردەوام هاوڕێیەتیت ئەكات و هاودەمی یەكترن ، لە ژیاندا ماوەیەكی زۆر بەیەكەوەن ، ئەگەر چەند ڕۆژێكی كەم نەیبینی بیری ئەكەیت و هەواڵی دیار نەبوونی لەخەڵك ئەپرسی ، بەڵام كاتێك ئەمرێت و خرایە ناو گۆڕ ناتوانی تەنها بۆ سێ ڕۆژیش لەگەڵی بمێنیتەوە ، چونكە ناو گۆڕ شوێنێكە لەناویدا لاشە ، جوانیەكەی نامێنێت و هەڵئەویشێتەوە ، پاشان ئەڕزێت و ئەبێتە خواردنی چەندەها گیانداری وەكو كرم و مێروولە و هی دیكە ، بەجۆرێك ئەگۆڕێت كە مرۆڤ ناتوانێت بۆساتێكیش سەیری بكات ، ئەو بۆنە خۆشەی ئەگۆڕێت بە بۆنێكی بۆگەنی ناخۆش . وتیشی : پاشان هەناسەیەكی خەمباری هەڵكێشا و لەبەر كاریگەریەكەی بورایەوە .

لە وهەیب كوری وەرد كە ئەگێڕێتەوە و ئەڵێت : پێیان ڕاگەیاندین جارێكیان شەرعزانێك سەردانی عومەری كوڕی عبدالعزیز ئەكات و پێی ئەڵێت : سبحان الله . وەك ئەوە وابو كار و كردەوەكانی زۆر بەلایەوە جوان بن . هەروەها وتی : لەپاش ئێمە گۆڕاوی ! عومەریش پێیوت : ئایا بۆت ڕوون بۆتەوە ؟ ئەویش وتی : دەسەلآتداری بڕواداران گەورەترە لەمە . ئەویش پێیوت : ئەی فلآنە كەس ئەوكاتە چۆن ئەبێت ، دوای سێ ڕۆژ لەمردنم ، و لەناو گۆڕدا نێژرابم ، تۆش ببینی هەموو لاشەم لەبەریەك هەڵوەشاوەتەوە , و چاوەكانم نەماون كوڵمەكانم تواونەتەوە و ڕزیون ، لێوەكانم لە ددانەكانم جیابونەتەوە ، ناو سك و سینگم بۆگەنی كردبێت , و كرمیش لەدواوەم بێتە دەرەوە .

ئەگێرنەوە لە شوعەیبی كوڕی بابی حەمزە، كە ئەڵێت : جارێكیان عومەری كوڕی عبدالعزیز نامەیەك ئەنوسێت و ئەینێرێت بۆ هەندێك لە دەسەلآتدارانی ناوچەی شام ، و تیایدا ئەنوسێت : لە پاش سوپاس و ستایشی خوا (ﷻ) ئایا چەند خاك و خۆڵ هەنە كەوا لاشەی مرۆڤیان ڕزاندبێت و لەناو بردبێت ، چەند كرم و مێروو هەنە كە لەناو لاشەی مرۆڤ لانەیان

کردبێت ، بۆیە خۆم و ئێوەش ئاگادار ئەکەمەوە و ئەترسێنم لەو ڕۆژەی کە خوای گەورە (ﷻ) ئەمانوەستێنێت و لێپرسینەوەمان لەگەڵ ئەکات .

بە سەنەدەوە باوکی نەعیمی (الحافظ) ئەگێڕێتەوە کە جارێکیان عمر کوری عبدالعزیز بەشدار ئەبێت لەناشتنی تەرمی کەسێکی نزیکی خۆی ، پاشان ڕوو ئەکاتە هاوەڵەکانی و ئامۆژگاریان ئەکات ، باسی خراپەی گیرۆدەبوون بە دنیایان بۆ ئەکات ، هەروەها باسی ئەوانەش ئەکات کە لە دنیادا بە خۆشی ژیاون و لە هیچ شتێکیان کەم نەبووە، ئێستاکەش مردوون و چونەتە ناو گۆڕ ، و هەمو جوانیەکەیان لەناو چوە و ماڵ و سامانەکانیشیان بێ سوودە بۆیان و کەسانی دی سوودی لێئەبینن نەك ئەوان " هەروەها ئەم قسانەشی کردن " و وتی : ئەگەر بەلایان دا (واتە : بەلای گۆرساتن دا) ڕۆیشتی ، ئەگەر ویستت بانگیان بکە ، هەروەها ئەگەر پێویستیش بوو داوایان لێبکە بێنەلات ، یان بەلایان دا برۆ سەیری نزیکی ماڵەکانیان بکە لەیەکتری ، لە دەوڵەمەندەکانیان بپرسە : ماڵ و سامانیان چەند ماوە ؟ بەهەمان شێوە لە هەژارەکانیش بپرسە : ئایا ئەوان ئێستاکەش هەر هەژارن ؟ لە زمانیان بپرسە کە قسەیان پێ ئەکرد ، لەچاوەکانیان بپرسە کە چێژیان بەهۆی بینینی شتەکان وەرئەگرت ، پرسیار لەبارەی پێستە تەنکەکەیان ، ڕووە جوانەکەیان ، و لاشە قۆزەکەیان بکە : بزانە کرمەکانی ناو گۆڕ لەژێر کفنەکانیان چیان لێ کردوون ، گۆشتەکەیان خوراوە ، ڕووە جوانەکەیان نەماوە ، لاشەیان هەموو ڕزاوەتەوە ، کوانێ دانیشتن و سەرنجی جارانیان ؟ کوانێ بەردەست و خزمەتکارەکانیان ؟ ماڵ و سامان و دەسەڵاتەکانیان ؟ سوێند بەخوای گەورە ئەمانە هیچ لەهانای ئەوانەوە نەهاتن ، ئایا ئێستا بەتەنها لەناو گۆڕدا نین ؟ ئایا شەو و ڕۆژ لەلای ئەوان وەکو یەك نیە ؟ ئایا لە تاریکیەکی زۆر قوڵ دا نین ؟ تەنها خۆیان و کردەوەکانیانن ، هەموو خۆشەویستانیان لێ دابڕاون ، چەندەها کەسی ڕوو جوان و باڵا بەرز هەبون ئێستا ئەو جوانیەیان نەماوە ، لاشەکەیان ڕزیوە کێم و زوخاو لە جیاتی خوێن لە لاشەیان دا هەیە و شوێن و داڵدەی چەندەها کرم و زیندەوەرانی دیکەیە ، ئێسك و گۆشتیان لەیەك جیابونەتەوە ، پاشان هەرماوەیەکە، هەموو مایەوەی لاشەکانیان ئەبێتەوە خاك و خۆڵ ، ئەی ئەوە نیە ماڵ و سامانیان لەدوا بەجێماوە ، ئەم دنیایە فراوانەیان لێ

تەسك بۆتەوە و چونەتە ناو گۆڕ ، ژنەکانیان شوویان کردوە ، منالّەکانیان هەریەکەو بەلایەکدا پەڕاگەندە بوونە ، کەسێکی دیکە لەشوێن دەسەلاّتیان دانیشتوە ، مالّ و سامانیان دابەش کراوە . ئینجا "سوێند بە خوای گەورە ﷻ" هەیانە خوای گەورە گۆڕەکەی بۆ فراوان کردوە ، خۆشی پێ ئەبەخشێت لەناو گۆڕدا . بۆیە ئەی ئەو کەسەی بەیانی ئەڕۆیتە ناو گۆڕ چ شتێك لە دنیادا تۆی لە خشتە بردوە ؟ ئایا ئەزانیت ئەو شتە تاهەتایە بۆ تۆ ئەمێنێت و ئەویش هەروا بەمشێوەیە بەردەوام هەر هی تۆ ئەبێت ؟ کوانێ مالّ و سامانەکانت ؟ بەروبوومە زۆر و فراوانەکانت ؟ کوانێ جل و بەرگەکانی زستانە و هاوینەت ؟ ئەی کوانێ گولاّو و بۆنە خۆشەکانت ؟ نەخۆشیەکی قورس ئەگرێت ، ناتوانێت بەرگری لەخۆی بکات ، ترس و لەرزێکی زۆر ، ئاو و ئارەقی گوڕ لە لاشەی دائەچۆڕێت ، گەروی لە تینوان وشك ئەبێـت ، دێتە سەرەمەگ، هۆشی لەلای خۆی نامێنێت ، ئەمە فەرمانێکە لەئاسامانەوە لەلای خوای گەورە (ﷻ) هاتۆتە خوارەوە ، فەرمانێکە گەڕانەوەی بۆ نیە ، هەرگیز لە کاتی خۆیدا دواناخرێـت ، بیر بکەنەوە : ئەی ئەوانەی چاوی منالّ و باوك و برا دائەخەن ، ئەوانەش کە ئەیان شۆن ، هەوەها ئەی ئەوانەی کفنیان ئەکەن و لەناو گۆڕدا ئەیانێژن ، پاشان ئەگەڕێنەوە سەرکارەکانتان ، خۆزگە هەستم بکردبا هەستت چۆنە لەسەر ئەم خـاکـە زبرە ، خۆزگـە بمزانیبایە کامـە کولّمەت لـە پێش دا ئەڕزێت ، ئەی هاوسێی ناخۆشیەکان ئێستاکە مردوی ، خۆزگە بمزانیبا هەستم چۆنە کاتێك فریشتەی گیان کێشان دێتە سەرم و "چ"پەیامێکی لە لای پەروەردگار لەگەڵ خۆیدا بۆ من هێناوە .

پاش تەواو کردنی ئەم وتانە، عومەر "میهرەبانی خوای گەورەی لێـبێت" ڕۆیشت و تەنها هەفتەیەك دوای ئەمە ژیا و ئینجا کۆچی دوایی کرد .

هەروەها لەچەند ڕێگەیەکی جیاواز لێی ئەگێڕنەوە ، لە دوایەمین وتاریدا، کە لە کۆتایی ژیانی وتویەتی : ئایا بیر ناکەنەوە لەوەی کە ئێوە لەو کەسانەن کە لەناو ئەچن و لاشەتان ئەڕزێـت لەناو خاك دا ، مالّ و سامانەکانیشتان بۆ ئەوانەی دوای خۆتان بەجێ ئەمێنێت ، ئایا بیر لەوە ناکەنەوە بەردەوام هەمو ڕۆژێك یەکێکی زیندوو ئەمرێت و ئەیبەنە گۆڕستان و لەوێ لەناو گۆڕ ، لەسەر خاکێکی وشکی بێ ڕایەخ ، هەروەها تاریك و تەسك ئەینێژن ، لە خۆشەویستەکانی

جیا بۆتەوە، هەموو شتێکی بەجێهێشتوە ، لەناو خاك دا نیشتەجێ بوە ، ئێستا تووشی لێپرسینەوەی کارو کردەوەکانی ژیانی دنیای ئەبێتەوە ، پێشتر دەوڵەمەند و بەدەسەلات و بەهێز ، بەڵام ئێستا هەژار و لاواز بێ دەسەلات .

جارێکیان لە گۆڕستان ئامادەی ناشتنی تەرمی مردوێك بوو ، کاتەکەش گەرما و ڕۆژیش بەدەرەوە ، ئاسمانیش ساماڵ و بێ هەور بوو ، لەوێ سەرنجی دا و بینی هەندێك کەس لەبەر تینی گەرمای ڕۆژ ئەچنە بەر سێبەر ، بۆیە دوای سەلاوەت وتن لەسەر دیداری پێغەمبەر (ﷺ) ئەم شیعرانەی وت :

(کەسێك دەم وچاوی بەر گەرما و تینی ڕۆژ ئەکەوێت
یان تووشی ، تۆز و خۆڵ ئەبێت
سێبەر و خۆشی هاودەمی ئەبێت
بێ ئاگا لەوەی ئەڕوا بۆ ناو خاك
لاشەی بێ جوڵەی ، لەناو تاریکی دا
سەر گەردان ئەبێت
خەم و پەژارەی لەناو چاڵی گۆڕ
بەردوام ئەبێت
مادام هەر وایە ، ئامادەباش بە
ئەگەڕێیتەوە جێ
ئەو جێیەی لێپرسینەوەت
لەگەڵ دا ئەکرێت) .

ئیبن ئەبو دنیا ئەگێرێتەوە، جارێکیان محمد کوری واسع سەردانی بیلال کوڕی باوکی (بردە) ئەکات ، پرسیاری لەبارەی چارەنووسی لێ ئەکات ، ئەویش لە وەڵام دا پێی ئەڵێت : بیر لەوانە بکەوە کە لەناو گۆڕستان دان ، ئەمە چارەنووست لەبیر ئەباتەوە .

لە (مغيث)ی خواپەرست ئەگێرنەوە كە وتويەتی: هەمو ڕۆژێك سەردانی گۆرستان بكەن دوا ڕۆژتان بیر ئەخاتەوە .

نەصر باوكی منذر بە براكانی ئەڵێت : بیر لە ڕۆژی زیندوبونەوە و دیمەنی لێپرسینەوەی ئەو ڕۆژە بكەن ، هەمیشە گۆڕتان لە یاد بێــت ، بشزانن ئەمە ڕۆژێكە بێگومان هەر دێتە ڕێتان و ناتوانن لەبەری دەرچن ، بۆیە ئەوەی باشە بۆ ئەو ڕۆژە ، بۆ خۆتانی ئامادە بكەن .

ئەحمەد كوڕی باوكی حەواری ئەڵێت : گوێم لە مضر كوری عیسی بو ئەیوت : میهرەبانی خوا لە ئەو كەسانە بێت بە بیر كردنەوە سەردانی برایەكانی خۆی ئەكات ، كە لەناو گۆڕ دان ، و بیر لە بارودۆخی ئێستایان ئەكاتەوە .

لە عبدالله كوڕی مبارەك ئەگێرنەوە ، كە ئەڵێت : جارێكیان پیاوێك بەلای خواپەرستێك ئەڕوات كە لە نزیك گۆرستانێك و زبڵخانەیەك وەستاوە . پیاوەكەش بانگی ئەكــات و پێی ئەڵێت : ئەی دنیا نەویست ئێستا تۆ لەنێوان دوو گەنجینەی دنیا دایت ، پەند و ئامۆژگاریان تێدا هەیە ئەگەر بیری لێ بكەیتەوە : یەكیان گەنجینەی ماڵە ، ئەویدیكەش گەنجینەی مرۆڤەكانە .

ئیبن ئەبو دنیا ئەگێڕێتەوە و ئەڵێت : ئەبو محمد كوری ئەخەغی باسی غەننامی كوری علی ئەكات و ئەڵێــت: ڕۆژێكیان غەننام لەگەڵ هاوەڵەكانی ئەبێت ، كتوپڕ ڕائەچڵەكێت، ئینجا یەكێك لە هاوەڵەكانی پێی ئەڵێت چ شتێكت تووش بوو ؟ ئەویش وتی: گۆڕم بە بیر هاتەوە.

ئەبو محمد ئەڵێت: محەمەد كوری احمد بۆی گێڕامەوە ، و ئەڵێت : هشامی (الدستوائی) ئەڵێت : هەندێك جار بیر لە مردو ئەكەمەوە كاتێك كفن كراوە و لەناو گۆڕدا نێژراوە و لاشەكەی ڕزیوە ، كاتێك ئەوەم بیر ئەكەوێتەوە خەم و پەژارەیەكی زۆر دامئەگرێــت .

هەروەها ئەم شیعرەش لە كوڕی موبارەك ئەگێرنەوە ، كە ئەڵێت :

(ئەی ئەو كەسەی خزم و بێگانەی

بەردەوام لەناو گۆڕدا

ناشتوە

پێویستە بیرێك بكا لە داهاتوو

لە تاریکی

وا لەنێو گۆڕ خەوتوە

ئەی ئەو کەسەش بە هیوای نەمرییە

وا لە گێژاوی هەڵەو تاوانا

بێ ئاگا کەوتوە) .

ئیبن ئەبو دنیا ئەڵێت حسین کوری عبدالرحمن ئەم شیعرەی لەبارەی ناخۆشی ناو گۆڕ بۆ وتم ، و ئەڵێت:

(بابگریێت لەتاو ناخۆشیەکانی رۆژی زیندوبونەوە

کەسێك کە ئەگریێت

لە ترسی ئازارەکانی ناو گۆڕ

بەسیەتی خەم و پەژارە بۆ رۆژێك رێزی ئەگرن

چونکە ...

رێز گرتنی تەواو وا لەناو خاکدا

کە رێزی ئەگرن) .

* * * * *

ئەوزاعی لە یەحیا کوڕی ئەبو کثیر ئەگێڕێتەوە و ئەڵێت : ئەبو بەکری صدیق لەتارەکانی "هەمیشە" ئەیوت : کوانێ ئەوانەی بە گەنجی و جوانی خۆیان ئەنازی ؟ کوانێ ئەوانەی لەبەرەی جەنگ دا خۆیان لە هەموو کەس بە ، بەهێزتر دائەنا ؟ کوانێ ئەوانەی بینای بەرزیان دروست کرد ؟ ئەی ئێستا لەکوێن ؟ وا لەناو گۆڕدا لەژێر خاك ، وا لەناو تاریکی دا بە تەنها لەگەڵ کردەوەکانیان ماونەتەوە ، بۆیە ئەی موسڵمانینە خێراکەن خۆتان ڕزگار بکەن پێش ئەوەی مردن یەخەتان پێبگرێت .

بەسەنەدەوە ئیبن ئەبو دنیا لە حەسەن ئەگێڕێتەوە : جارێکیان گەنجێك بەلایدا تێپەڕ ئەبێت کە پۆشاکێکی زۆر کەشخەی لەبەرە ، لەهەمان کاتدا زۆریش لەخۆی ڕازیە ، بۆیە (حسن)یش پێی ئەڵێت : ئەی ئەو کەسەی بە گەنجی خۆی ئەنازێت و خۆی زۆر پێ جوانە ، بزانە ئەوا گۆڕ چاوەڕێتە بۆ ئەوەی ئەم لاشەیەی زۆرت خۆش ئەوێ بیڕزێنێت و لەگەڵ خاك و خۆڵ دا تێکەڵی بکات ، هەروەها کاتێك ئەچیتە ناو گۆڕ هیچ شتێك لەگەڵت نایەتە ئەوێ تەنها کار و کردەوەکانی ژیانی دنیات نەبێت ، خاك بەسەر ، دڵی خۆت تیمار بکە ، پاك بکەوە لە تاوان ، چونکە خوای گەورە (ﷻ) تەنها ئەوانەی خۆش ئەوێت کە دڵی خۆیان پاك ئەکەن وخۆیان چاك ئەکەن، و دوور ئەبن لە تاوان و بێ فەرمانی خوای گەورە.

هەروەها عبداللە کوڕی عیزار ئەڵێت : مرۆڤ دوو ماڵی هەیە : یەکێکیان لەسەر ڕووی زەویە ، ئەویتریشیان وا لەژێر زەویە ، پاشان گرنگی بە ئەو ماڵەی سەر ڕووی زەوی ئەدات ، بە جوانترین شێوە ئەیڕازێنێتەوە ، نایەڵێت هیچ کەمو کورتیەکی هەبێت . بەڵام ماڵەکەی دیکەی "واتە : ئەوەی ژێر زەوی" پشت گوێی ئەخات و گرنگی پێنادات ، بەڵکو لێ ئەگەڕێت تاوەکو ئەڕوخێتە ناویەکتری و خەراپ ئەبێت . ئینجا یەکێك دێت و پێی ئەڵێت : ئایا ئەزانی ماوەی چەند ڕۆژ لەسەر ئەو ماڵەی سەر زەوی ئەمێنیتەوە کەگرنگیەکی تایبەتیت پێداوە و بەتەواوی ئاوەدانت کردوەتەوە ؟ ئەویش ئەڵێت : نازانم . پاشان پێی ئەڵێت : ئەی ئەزانیت ماوەی چەندێك ئەمێنیتەوە لەناو ئەو ماڵەی کە هیچ گرنگیت پێ نەداوە و لێی گەڕاوی تاوەکو بڕوخێت و هیچ سوودێکت پێ نەبەخشێت ؟ ئەویش ئەڵێت : ئەمە ماڵی هەمیشەیی منە . پاشان پێی ئەڵێت : ئایا دانی پێدائەنێیت ، ئایا تۆ ژیری لەم کارەی ئەیکەیت و ئەیڵێیت ؟! .

لەحەسەنی ئەگێڕنەوە ، کە ئەڵێت : دوو شەو و دوو ڕۆژ بەسەر بونەوەر دادێن ، کە هاو وێنەی نیە :

شەوێکیان ئەو شەوەیە ئەچیتە ناو گۆڕ ، بەڵام لە شەوی پێش مردن دا تۆبەت نەکردوە ، شەوی دووەمینیش ئەو شەوەیە کە بەیانیەکەی ڕۆژی زیندووبونەوەیە . ڕۆژەکانیش : یەکێکیان بریتیە لەو ڕۆژەی

مژدەدەرێك لەلای خوای گەورەوە (ﷻ) بۆ لای تۆ دێت ، نازانیت ئەو هەواڵەی بۆت ئەهێنێت ئایا بۆ بەهەشتە یان بۆ دۆزەخە ؟ هەروەها ڕۆژی دووەمیش : ئەو ڕۆژەیە نامەی کردەوەکانت پێ ئەدرێتەوە بەڵام نازانیت ئایا بە دەستی ڕاست یاخود بە دەستی چەپ ئەدرێتە دەستت ؟

ئەگێرنەوە عومەری کوڕی ذر هەموو جاران لە ئامۆژگاریەکانی ئەیوت : ئەگەر ئەوانەی تەندروست باشن و گرنگی تەنها بەلاشە ئەدەن ، بیانزانیبا ناو گۆڕ شوێنی ڕزینی لاشەیە ، و تەنها کردەوەی باشە لە فریایان ئەکەوێت ، ئەوا لە دنیادا کاتی خۆیان بە فیڕۆ نە ئەدا و بەردەوام خواپەرستیان ئەکرد ، لە ترسی ئەو ڕۆژەی کە چاوەکان لەبەر سامناکی و گەورەییەکەی ئەبلەق ئەمێنن .

لە مطرف کوڕی عبداللە کوڕی (الشخیر) ئەگێرنەوە کە ئەڵێت : گۆڕماڵێکە لەنێوان دنیا و دوارۆژ ، ئینجا هەر یەکێك بە توێشوو ئامادەکاری تەواو بچێتە ئەوێ ، ئەوا بە ئاسانی ئەچێتە ژیانی دوارۆژی، بەڵام لەوێ هەر یەکە و بەگوێرەی ئەو توێشوەی ئامادەی کردوە ئەگەر چاك بێت ئەوە سەرەنجامی چاك ئەبێت و جگە لە ڕەزامەندی خوای گەوە (ﷻ) ئەچێتە بەهەشتی پان و بەرین ، بەڵام ئەگەر کارەکان و توێشووی خراپ بێت ، خوای گەورەشی لێ ئەتۆرێ و سەرەنجامەکەشی ناو دۆزەخی پڕ لە ئاگر و ئازارە .

(حسن)یش ئەڵێت : خۆتان ئامادە بکەن بۆ ڕۆیشتن ، ڕۆژێکی ناخۆشتان لەپێشە .

ئەگێرنەوە جارێکیان پیاوێك بە خواپەرستێکی پێشین (سلف)ی وت: ئامۆژگاریم بکە . خواپەرستەکەش پێیوت : سەربازەکانی مردن چاوەڕێی تۆن هاکە تۆش چویتە ڕیزی ئەوان .

هەموو جار باوکی عمران ی جونی ئەیوت : هەڵمەخەڵەتێن و لە خۆتان بایی نەبن بەو مۆڵەتە درێژەی خوای گەورە (ﷻ) پێتانی بەخشیوە ، و وابزانن لەبیرکراون ، بەردەوام هەر لە ئەو ژیانە خۆشەدا ئەبن ، چونکە بەڕاستی تووڕەبوونی خوا و سزاکانی زۆر گەورە و قورس و بەئێش و ئازارە ، هەتاوەکو کەینێ رووی ئەولیا و دۆستانی خوای گەورە هەر لەژێر خاکدا بێت ، ئاگادارین ڕۆژی ناخۆشی ئێوەش دێت ، کە ڕۆژی زیندووبونەوەیە ، بۆ ئێوە سزا و ئازارە ، بەڵام بۆ ئەولیا و دۆستانی خوا ، بەهەشتی ڕازاوە و نەبڕاوەیە ، سەرەڕای لێبوردن و ڕەزامەندیەکەی .

محمد کوڕی واسع ئەڵێت : هەموو ڕۆژێك لە ئێمە سێ جۆر کەس ئەچنە نێو گۆڕ وەکو ئەوە وایە کە هەمووومان بەشدارین لەم خەمەدا ، ئەمە بەردەوامە تاوەکو هەموومان بەیەکەوە لەنێو گۆڕدا بەیەك ئەگەینەوە .

جارێکیان حەسەن ئامادەی ناشتنی تەرمی مردوێك بوو ، کاتێك خەڵك کۆبونەوە بۆ ناشتنی، حەسەن یش وتی: خودا بە میهرەبانی خۆی لەگەڵتان بجوڵێتەوە، وریابن ! بۆ ڕۆژێکی وەکو ئەمڕۆ

کاربکەن ، بزانن ئەوانەی ئێستا وان لەناو گۆڕ ، هەموو لەخۆتان بوون، ئەوان لە پێش ئێوەدا کۆچیان کرد و چونە ناو گۆڕ ، ئێوەش بەهەمان شێوە بەدوای ئەوان دا ئەڕۆنە ئەوێ ، ئەی ئەو کەسەی لە دوای برا مردووەکەی بەجێماوە ، دڵنیابە بەیانی نۆبەی تۆش دێت و ئەچیتە ناو گۆڕ ، تەمەنت تەواو ئەبێت و بەیانی ئەمریت ، هەروەها ئەوانەی دوای تۆش پاش ماوەیەك گیانیان دەرئەچێت و ئەمرن ، هەمووتان یەك بەدوای یەك لەکاتی خۆی بەبێ دواکەوتن ئەمرن ، هەتاوەکو هەموتان ئازاری سەرەمەرگ ئەچێژن و لەناخۆشیەکەی بەشدار ئەبن ، پاشان ئەچنە ناو گۆڕ ، دواتر هەمووتان زیندوو ئەبنەوە و ئەڕۆنە زەوی لێپرسینەوە ژێر دەسەڵاتی بەهێزی خوای گەورە (ﷻ) ، لەوێش لێپرسینەوەی کردەوکانتان لەگەڵ ئەکرێت

صفوان کوڕی عومەر ئەڵێت : جارێکیان کۆمەڵێك کەس باسی خۆشی و نیعمەتەکانی دنیایان ئەکرد ، لەگەڵیش نمونەیان بەکەسی دەوڵەمەند "واتە : باسی خەڵکیشیان ئەکرد ئەوانەی لەخۆشی دا ئەژیان" پیاوێکیش لە ئامادەبوان وتی : دڵخۆش ترین و بە خۆشی ترین کەس ئەو کەسەیە کە لەکاتی مردنیان کاتێك لاشەکەی لەناو خاك و خۆڵ دایە دڵنیا بێت لەوەی سزا نادرێت و چاوەڕوانی ڕەزامەندی خوای گەورە ، و پاداشتە زۆر و گەورەکانی بکات .

مەسروق ئەڵێت : بۆ بڕوادار هیچ ماڵێك وەکو ناو گۆڕ خێر و چاکەی تێدانیە ، چونکە لەوێ لە خەم و پەژارەکانی دنیا ، یاخود لە سزای خوای گەورە ڕزگاری بووە .

بیشری کوڕی حارث ئەڵێت : ناو گۆڕ باشترین ماڵە ، بۆ ئەو کەسەی ملکەچی فەرمانەکانی خوای گەورەیە .

فضل کوڕی عەسال ئەڵێت : جارێکیان پیاوێك بەلای گۆڕیکی هەڵکەنراو دا ڕۆیشت ، پاش ئەوەی ماوەیەك سەرنجی دایە ، وتی: باشترین شوێن کاتێك بڕوادار بۆی ئەگوازرێتەوە ئێرەیە "واتە : ناو گۆڕە" .

هەروەها لە عەقیبەی بەزار ئەگێرنەوە کە ئەڵێت : جارێکیان ئەعرابیەك تەرمی مردوێك ئەبینێت بەرەو گۆڕستانی ئەبەن ، ئەویش ڕووی تێ ئەکات و پێی ئەڵێت : خۆشی لە خۆت ، خۆشی لە خۆت ، پیرۆزبایت لێ ئەکەم . بۆیە منیش پێموت : پیرۆزبایی لەچی ئەکەیت لەکاتێك دا ئەمە مردوە ؟ ئەویش وتی: چۆن پیرۆز بایی لەکەسێك نەکەم ، بەنیازە بڕواتە لای باشترین هاوسێ ، باشترین خانەخۆ ، گەورەترین لێبوردە . عەقیبە ئەڵێت : وەکو ئەوەوابو ئەو قسەیەم بۆ یەکەم جار بەر گوێ کەوتبێت ئەوەندە کاریگەر بوو .

ئیبن ئەبو دنیا ئەڵێت : ئەبو مالیكی (البجلی) لە ئەبو معاویەوە بۆی گێڕامەوە ، و ئەڵێت : زۆربەی كات كە مالیكی كوڕی مەغول پێمنەگەیشت ، ئەم وتەیەی ئەوت : ژیانی دنیا لەخشتەت نەبا ! ئاگاداری ناو گۆڕ بە، چونكە ڕوداوی زۆر گەورەی لێ ڕوونەدات ، یان ئەبێتە شوێنێكی خۆش یاخود بە پێچەوانەوە .

هەروەها وتی: احمد كوڕی محمد (الازدی) بۆی گێڕامەوە , و ئەڵێت : حامد كوڕی احمد كوڕی ئەسەد قسەی ئەكرد و ووتی : ڕۆژێكیان علی كوڕی (جبلە) دەستی گرتم ، و ئینجا چوینە لای ئەبو عەتاهیە ، كاتێك گەیشتینە لای ، لەوكاتەدا ئەو لە گەرماو بوو ، ماوەیەك چاوەڕێمان كرد ، زۆری پێنەچوو هاتە دەرەوە ، لەوكاتەش ئیبراهیم كوڕی مقاتل كوڕی سەهل هاتە لای كە ، كەسێكی قۆز و زۆر جوان بوو ، ئەبو عەتاهیە ماوەیەك سەرنجی دایە و لێی ووردبووەوە ، ئینجا ئەو شیعرەی بەسەردا وت :

(ئەی ڕوو جوانەكان دوایی هەر ئەمرن

پاشان خاك ئەتانرزێنێ

ئەی ڕوو جوانەكانی بالآبەرزی ئەندام ڕێك و پێك) .

پاشان علی كوڕی جبلە وتی بنووسە:

(ئەی تەن پەروەری گەنجی بێ پەروا

بەلآم بۆ ناو خاك

لەوێ كارەساتە وا ڕوو ئەدا

خۆشیتان زۆر بێت یاخود كەم

ناو تاریكی ملكەچتان ئەكا)

ئەبو عەتاهیەش وتی: ئەی حامید بڵێ ، وا منیش ئەڵێم : لەگەڵ تۆ و ئەبو (حسن)مە ، ئەویش وتی : بەڵێ . ئینجا ووتم:

(ئەی نیشتەجێیانی دنیا

بیربكەنەوە

ئامادەسازبن

وا لەسەر گۆڕن

جوان بن یاخود نا

ناتانپارێزێ لە تاریكیا

لە كرم و ڕزین

لە ، لەناو چونی لاشەیا

پۆشاکتان هەبێ

بپۆشن یاخود نا

هەر بەڕووتینە وا لەناو خاکا

هەر ئەبێت بمرن بچنە ناو گۆڕا

ببینن لەناوچونی لاشە و خەیاڵتان) . ....

* * *

ئەم پەرتووکە بە یارمەتی خوای گەورە (ﷻ) لەسەر دەستی هەژارترین بەندەی خوا بۆ میهرەبانیەکەی ، محمد کوری یوسف کوری عومەر (الضميري) حەنبەلی ، لەدوای نوێژی عەسری ڕۆژی چوارشەممە ، بەرامبەر بە یانزەی (ربيع الاول)ی ساڵی هەشت سەد و پەنجا و دووی کۆچی ، تەواو کرا ، ئەی خوای گەورە بیکە بەمایەی سوودو قازانج بۆ بڕواداران ، بەهۆی ئەم فەرموودانەو وتانەی پیاو چاکان کە لەناویدا هەیە . ئیتر سوپاس و ستایشێك بۆ خوای گەورە کە شایانی گەورەیی و ڕێزەکەی بێت ، هەروەها دروودو سەلام لە دیداری پێغەمبەر (ﷺ) و ئال و هاوەڵ و شوێنکەوتوانی بێت ، تا ڕۆژی زیندوبوونەوە .

* * * * *

## ناوەرۆك